## لەم ژمارەیەدا




الاشراف الفني: ص. ع

رۆشـــــنبیری نـــوێ
گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتی مانگانەیە
دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

سەر نووسەر
مصلح مصطفی جەلالی



# ٧ ی نیسان

# رۆژی پیرۆزی لەدایك بوون و پرشنگی سەركەوتن



حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالست حزبێکە لە مندالْدانی نەتەوەیی‌و ئێش‌وئازاری عەرەب‌و نیشتمانی لەت‌لەت‌کراوی ژێردەستەو دواکەوتوودا چاوی هەلْێنا . . بیروباوەرە رەسەنەکەشی کە نەتەوەیی سۆشیالستی دیموکراتی‌یە چرای سەر ڕێگای کاروانی بە ملیۆنان چەوساوەی هارڕاوەی ژێر چەرخی دەرەبەگی‌و خوێن‌مژی‌و حوکمڕانانی بەکریگیراوی بێگانە بوو .

بۆ یەکەم جار سێ دروشمی هێژای (یەکیەتی ، سەربەستی ، سوشیالزم) لە ئاسمانی نیشتمانی گەورەدا بەرزبووەوەو بوون بە وەلامێکی دەمکوت‌کەرو شۆرشگێرانەی ژینی کەنەفتی‌ی سالانی چلی ئەم سەدەی بیستەمەو بوون بە رابەری بیرو کردەوەی تێکۆشانی سەختی جەماوەرانی عەرەبی رابەریو هەر لە کەنداوەوە هەتا ئەتلەسی .

ئەم سالْ جەژنی لەدایك‌بوونی حزبمان گەلێ لە سالانی پێشوو گەشترو بەرووم‌بەت‌و پرشنگدارتر دەبێت ، چونکە ئەمسالْ سەرکەوتنەکانمان لە قادسییەی صدام‌دا ماناکانی حەوتی نیسانی نەمر گەشتر دەکات‌و ئامانجە مەزنەکانمان لە کۆری ژیندا دەچەسپێنێت‌و ڕێگەی سەرکەوتن بۆ نەتەوەکەمان بەکردەوە دەست‌نیشان دەکات .

لە ٧ی نیساندا . . رابەرانی بەعس دلْسۆزانەو لەخۆبوردووانە تۆوی بیری نوێیان چاندو تیشکی خەباتی خوێناوییان لە مەیدانی شەری دواکەوتن‌و زایۆنیزم‌و ئیمپریالزم‌و نۆکەراندا بە . کردەوە .

بەعسی‌یەکان لە پێشەوە بوون ، هەمیشە پێشرەو بوون ، کەوتنە جەنگان دژی ساختەکاری‌و پاك‌کردنەوەی ژەنگوژاری دەروونی خەلْکەکە ، پاك‌کردنەوە لە هەموو پەلەو چلْکێکی بێگانە بە گیانی



نەتەوەو کەلەپوورو نەریتە نەمرەکەی نەتەوە . بۆ ئەوەی لەم خاکە پاکەدا نەمامی بەهاکانی مافو چاکەو یەکسانیو دادو سەربەستی برۆینو نموونە بەرزەکانی شۆرشگێری پێشکەوتنخواز بلاوبکەنەوە . لەم رێگەیەدا بەرامبەری دوو بەرهەلست بوون ، یەکەمیان لەشکری ئەو کەللە بەردانەی کە بە هیچ جۆرێك نەیان دەویست بە گەشەکردنو گۆرانو بەرەوپێش چوون قایل ببن ، دووەمیان ئەو کەسانەی کە لایان وابوو چارەسەری یەکی جادووکارانە لە رێیەکەوە دێت کە دەبێ بەسەر شەخسییەتی نەتەوەییو پێناسو تایبەتییەکانی نەتەوە باز بدرێت . .

ئەم بەرەنگاری یە قورسە لە لایەکەوە ، لە لایەکی تریشەوە بەرەنگاربوونی توندوتیژی دەسەلاتداریی یەکتەنیو رژێمی دیکتاتۆری زادەی کۆدەتا سەرەوەیی یەکان دەستی پی کرد ، بەلام لە هەموو ئەم بەرەنگارییانەدا ئێمە بەهێز بووین چونکە ئامانجو چەکمان گەل بووە ، چونکە گەل سەرچاوەی گۆرینو بەلگەی رەوای گۆرینەکانەو بۆ سەرکردایەتیی گەل بۆ هێنانەدیی ئاواتەکانی لە گەل بەولاوە هیچ هێزێکی تر کاریگەر نی یە .

ئیتر حزبی بەعسی عەرەبی سوشیالست بوو بە قوتابخانەی یەکیەتیی خەباتو یەکیەتیی بیر بۆ تێکوشەرە رابەرەکانی ئەم پشتە هەر لە طەنجەوە هەتا رۆخەکانی کەنداوی عەرەب ، نەك هەر ئەمەش بەلکو ئەو خەباتە نەتەوەییو کۆمەلایەتی یەی کە حزبەکەمان دایلەکتیکەکەی دارشتووە کاری لە زۆر ئایدیولوجیەت کردووە کەوا دەمێکەو تا ئەمرۆ هەول دەدەن لە خاکی عەرەبدا جی پی یەك بۆ خۆیان ببیننەوە . ئەمە بوچی ؟ . . چونکە باوەری بەعسی باوەرێکی راستگۆیانەیە ، بێ پێچو پەنایە . . چونکە پوختەی خواستی نەتەوەیە بۆ ژینێکی سەربەستو یەکگرتوو سەربەخۆ ، تاکو بتوانێ بەبێ واسیتەو سێبەری بێگانە بەخشندەیی شارستانەیتی مرۆڤانەی خۆی بەردەوام پێشکەش بکات .

سال هاتو سال چوو . . حزب سەرکەوت . . حزب بەهێز بوو . . لە تاقیکردنەوەکانی خۆی شت فێربوو . . سالانی پر لە کارەساتو زەبرو زەنگی بەری کرد ، لەهەر لاوە داوو پیلانی هەلبری ، نەبەزانە بەرامبەر مەترسیی شێواندنو رەنگ لی بردن وەستا . . لە مەیدانی جەنگی بەردەوامدا لە هەرێمی عیراقاندا دەستکەوتێکی قارەمانانەی وەدەست هێنا ، مەزنترین داستانو تۆماری رووسووریی حزبەکەمان کە شۆرشی ١٧ – ٣٠ی تەمووزی سالی ١٩٦٨ بوو لە لاپەرەی مێژوودا نەخشاند .

لەم شۆرشەدا حزب تاقیکردنەوەی کاملانەو سەرکردایەتیی بلیمەتی بەهۆی راستورەوانیی رێگاو هەلکشانی بیرو رەفتار لە

چوارچێوەیەکی ڕەنگینی کرداردا نیگارێکی ڕازاوەو نموونەیەکی پاکی شۆڕشێکی نەتەوەیی سۆشیالستی بێ‌لایەن بە جیهان پێش‌کەش‌کرد ، شۆڕشێکی ناوازەو سەرکردایەتی‌یەکی بە کۆمەڵ‌و دیموکراتی کە بازووی بە زەبری بڕیتی‌یە لە جەماوەری گەل بە کرێکارو جووتیارو ڕۆشنبیرو سوپایی‌ی شۆڕشگێڕەوە .

لە ٧ی نیسانی ئەمساڵدا . . ساڵی ١٩٨٢ ، حزب داستانی پاڵەوانی‌و سەرکەوتنی بەسەر دوژمنی ڕەگەزپەرستی پەل‌هاوێژی فارسدا بە هەموو جیهان ڕاگەیاند ، ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوون‌و ڕەوانە بۆ پتەویی بنیادی شۆڕشگێڕانەو قووڵیی میللی‌یەتی‌و ژیریی فەرماندە هەڵکەوتەکەی .

ئەم جەنگە ، جەنگی وریایی‌و ڕێ‌خۆش‌کردنە بۆ جەنگەکانی چارەنووسی نەتەوەی عەرەب لەپێش هەموویان جەنگی ڕزگاری فەلەستین . شەڕی ئەمڕۆمان لە لابالی ڕۆژهەڵاتی نیشتمانی گەورەمان و تێك‌شکاندنی کۆتی داگیرکردن‌و خۆ بە خاوەن ناسین‌و هەڕەشەی بێگانە . .

دووپات کردنەوەی بەرنامەی خەباتی چەکدارو ئامادەکردنی ووزەو هێزی نەتەوەی عەرەبە لە ڕووی سوپایی‌و سیاسی‌و ئابووری‌یەوە بۆ بەزاندنی دوژمنانی نەتەوە .

ڕزگارکردنی ڕۆژهەڵاتی نیشتمان لە مۆتەکەی داگیرکردنی فارسی بەشداری‌یەکی تەواوو ڕاستەقینەیە لە ئامادەکردنی ووزەو هێزی زەبروەشێنی عەرەبدا بەرەو فەلەستین‌و هەموو پارچە زەوی‌یەکی داگیرکراو .

لە ٧ی نیساندا سڵاو لە سەرکەوتنەکانی قادسییەی صدام دەکەین ، سڵاوی ڕۆژی لەدایك‌بوون بۆ ڕۆژی پڕ لە شانازی‌و سەربڵندی . لە قادسییەی صدام‌دا ئەمڕۆ سەربازان‌و گەلی مەزنمان دووپاتی دەکەنەوە کە نەتەوەکەمان دەتوانێ بەرامبەر پیلان‌و پڕۆژەی دوژمنانی مافی سەربەرزی‌و یەکگرتنی نەتەوە بووەستێ . . دووپاتی دەکەنەوە کەنەتەوە دەتوانێ فەلەستین‌و هەموو گەردێك لە خاکو خۆڵ‌و هەموو دڵۆپە ئاوێك کە بێگانە زەوتی کردبێت ڕزگاری بکات .

ئیتر لە ٧ی نیساندا . . سڵاوی ڕێزو دڵسوزی بۆ هاوڕێ میشیل عەفلەق سەرکردەی دامەزرێنەر . .

پیروزبایی‌یەکی گەرم بەبۆنەی لەدایك‌بوون‌و سەرکەوتن لە هاوڕێ‌ی سەرکردەو جێگری ئەمینداری گشتیی حزب هاوڕێ صدام حسین .

«ڕۆشنبیری نوێ»



# حزبی بەعس و چارەسەری گەڵون



لە ٧ی نیسانی ئەم سالەدا (٣٥) سی‌وپێنج سالّ بەسەر لە دایك بوونی پارتی سەرکردە حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالستدا تێپەری . .

بێگومان ، ئالەم رۆژەدا کە زۆرانبازی لە نێوان نەتەوەی عەرەب‌و هەموو ئازادیخوازانی جیهان لە لایەك‌و زایۆنیزم‌و کۆنەپەرست‌و ئیمپریالیزم‌و هێزی ئیستعماری جیهانی لە لایەکی‌تر هەتا دێت گەرمترو توندو تیژتر دەبێت .

یادی لە دایك بوونی ئەم حزبە مانایەکی تایبەتی‌و ناوە رۆکێکی دیاری هەیە . . . بەتایبەت پاش ئەوەی کە پیلانی خۆبەدەستەوەدەرو رووڕە شان رۆژ دوای رۆژ بێ‌هێزو لاواز دەبێت‌و دوژمنانی عیراقی شۆرش بەتایبەتی‌و نەتەوەی عەرەب بەگشتی ، ترس دایان دەگرێت‌و لەهەر پیلانێکیاندا جگە لە سەرشۆری‌و پەشیمانی نەبێت هیچی تریان بۆ نامێنێتەوە .

حزبی بەعس ، هەر لەیەکەم رۆژی لە دایك بوونیدا ، لە ریزی خەباتی نسشتمانی‌و نەتەوەیی پێشکە وتووخوازدا دژ بە دژی دارو دەستەی بۆگەنی نوکەرایەتی‌و پاشایەتی ، جەنگاوەرو رابەری تێکۆشان بووەو ، لە رووبە رووبوونی زایۆنیزم‌و کۆنە پەرست‌و دکتاتۆریەت هەردەم لە ریزی پێشەوەو هەڵگری ئالاّی خەباتدا بووەو نەبەزانە وەستاوە .

لەو رۆژەی کە یادی ٣٥ سی‌و پێنج ساڵەی لە دایك بوونی حزبی سەرکردە زیندوو دەکرێتەوە ، نزیکەی (١٤) چواردە ساڵیش بەسەر بەرپا بوونی شۆرشە نەمرەکەی عیراق – شۆرشی جەماوەر ، شۆرشی ١٧ – ٣٠ ی تەمووز تێدە پەرێت . ئەو شۆرشەی کە هەر لە یەکەم رۆژی بەرپابوونیەوە بۆ بەرژەوە ندی نەتەوەو گەل‌و نیشتمان تێکۆشاوەو هەولّ دەدات .

ئەو هەنگاوە مەزنانەی کە ئەم شۆرشە ناویەتی‌و دەنێت ، جێگای شانازی‌و سەربەرزیە . . . بگرە ، هەر لە خۆماڵی کردنی نەوت‌و چاك کردنی باری کشتوکاڵ‌و نە هێشتنی دەرەبەگی‌و خۆرایی کردنی خوێندن لە گشت پلەکانیداو هەڵمەتی نیشتمانی تا دەگاتە بەرزکردنەوەی رادەی ژیانی گەل‌و دەیان دەسکەوت‌و هەنگاوی تری مەزن مەزن لە بووارەکانی رامیاری‌و ئابووری‌و کۆمەلایەتی کە گشت لایەنەکانی وولاّتیان گرتووەتەوەو ، نیشتمانی بەنرخیان لە بارودۆخی دوواکەوتووی پاشاوەی دەسەلاّتی

# ـــردنی کێشەکانـــی
# ـــەتـــەوە



بێگانەو کۆنەپەرستی و کۆیلەو دیلێتی رزگار کرد . هەر رابەرێتی ئەم شۆرشەش بوو کە مەسەلەی گەلی کوردمانی چارەسەکردو بەیاننامە مێژووەکەی (١١) ی ئازاری دەرکردو ئەنجومەنی راپەراندنو یاسادانانی بۆ کوردستان دانا . . . سەرەرای دەیان دەسکەوتی تری گرینگکبۆ گەلی کورد .

بەڵێ . . وە دوای ئەو هەموو هـــەنگاوە شۆرشگێریـــیـــە پێشکەوتووخوازنەی شۆرشی ١٧ ٣٠ ی تەمووز بە سەرکردایەتی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالست . عیراق بە جارێك بووە ئارمانجی پیلانی و ئـــیـمـپـریـــالـــیـزمو نـوکـــەرو بەکرێگیراوانیان . . . رۆژ دوای رۆژ بە نیەتی بۆگەنو چاوی چلێسترەوە سەیری عیراق شۆرشیان دەکرد . . هەر لایەنێکیان بەگوێرەی بۆ لووانو پێکران دەیوویست ئەم رەوتەی عیراق بگۆری و نەخشەی هەنگاوە پیرۆزەکانی بشێوێنیو لەم رێبازەی لابەرێت . ئەوەبوو ، ئیمپریالیزمی ئەمریکاو زایۆنیزمی روورەش ریسی پیلانێکی تازەیان – بەرێگای رژێمی خومەینی – بۆ عیراق پەشتەوە دوای ئەوەی کە پیلانە بۆگەنەکانی پێشوویان لەزەمانی شادا سەرنەکەوتوو خاو بووەوە .

وایان دەزانی کە بە ژیاندنەوەی رق وکینەی عەجەمو دەستکێ وەردانەوەی رژێمی ئێران لەکاروباری ناوخۆی عیراق . یەکێتی گەلی نەبەزو ئازاو دلێری عیراق لەق دەبێتو سەرەنجام عیراق بێهێز دەبێتو . ئەوساکە بەهەوەستی خۆیان عیراق بە خواستو وویستە بۆگەنەکانیان تۆ دەدەنو رۆژ دوای رۆژ چیان مەبەست بێ دەیچێننو دەیدروونەوە ! ! .

ئەو خەونە سەوزانەی ئیمپریالیزمی ئەمریکاو زایۆ نیزمی دوژمنو رژێمی بـــەکـــرێگیراوی دیمەشق هەڵوەشایەوە . . . ریسی ئامانجە بۆگەنەکانی خومەینی ی گەوجو دارو دەستە نەفامەکەی خاو بووەوە . پاش ئەوەی کە جەنگاوەرە خوێن گەرمو ئازاو نەبەردەکانی عیراق بە سەرکردایەتی پاڵەوانی رزگاریخوازی نەتەوەیی . سەرۆکی تێکۆشەر /صدام حسین/ دەرسێکی ئەوتۆیان گەیاندە رژێمی رەگەزپەرستو بەکرێگیراوی تارانو هاوکارو هاوپەیمانانی کە هەتایە لە بیریان ناچێت .

•

«رۆشنبیری نوێ»

# لە یادی ٣٥ ساڵەی سەرهەڵدانی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکیدا

کۆمەڵانی خەڵکی دلێری گەلەکەمان لەسەرانسەری وڵات ، بەوپەڕی شانازیو سەربەرزی‌یەوە ، پێشوازی لەیادی (٣٥) ساڵەی لەدایکبوونو سەرهەڵدانی حیزبی سەرکردە ، حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی ئەکات . . ئەو حیزبە دلێرەی کە بەوپەڕی هۆشمەندیو راستگۆیی‌و توانستی مێژوویی‌یەوە هاتە نێو کۆڕی ژیانی نەتەوەی عەرەب ، لەپێناوی راپەرینێکی فراوانی ئەم نەتەوەیەو لەپێناوی رابەری‌کردنی ئەو نەتەوەیەو بەدی هێنانی گشت ئامانجو خواستە نەتەوەیی‌یە رەواو مێژوییەکانی ئەم نەتەوەیە . . تا گوڕ بەدەوری پێشەنگانەی خۆی لەبنیادنانی ژیاری مرۆڤیەتی‌دا ، بداتو شوێنی شایانی خۆیشی لەنێو گەلانا بگرێتەوە . .

* سەرهەڵدانی حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی ، خۆی لەخۆی‌دا وەرچەرخانێکی یەجگار گرینگ‌و بنەڕەتیانە بوو لە جوڵانەوەی خەباتی گەلی عەرەبدا . . لەهەمان کاتیشا سەرەتای قۆناغێکی نوی‌و پێشکەوتوانەی نەتەوایەتی بوو چ لەئاستی ئامانجو هۆیەکان‌دا ، چ لەئاستی دروشمە دیارەکاندا . .

جگە لەوەیش بەدەنگەوەهاتنێکی راستەوراستو مێژوییانەی پێداویستیەکانی نەتەوەی عەرەب بوو ، بۆ بەگژاچوونی هێزە دەسرەشەکانی ئیمپریالیزمو زایۆنیزم ، کە چنگیان خستبوە نێو وڵاتی عەرەب‌و خێرو بێرو سامانی عەرەبەوەو یاری‌یان



بەچارەنووسی رەوای رۆڵەکانی ئەکرد .

بۆیەش ئەم حیزبە پێشرەوە سەری هەڵدا ، تا بەهۆیِ پێودانە تیوری و کاری دیسپیلنیانەو لەرێ ی بەرنامە بەرفراوەکانی خەباتەوە ، هەمو جۆرە بیروراو گۆشەسەرنجێکی پاشکەوتوانەی ئەو دەورو زەمانە ، رادات و جیٚ بهێڵیٚ و موژدەی جۆرە کۆشش و خەباتێکی تر بۆ گەلانی عەرەب و گەلانی تری بهێنیٚ .

• لەراستیدا ، مێژووی هاوچەرخی عەرەبی ، لەدژی پاشکەوتن و دابەشبوون و هەرەشەی ئیمپریالیزمانە ، بەشێکی گەورە ، لە مێژووی خەباتی حزبی بەعسی عەرەبی سوشیالیست ئەگرێتە خۆیەوە . .

لەماوەی ئەم (٣٥) ساڵەدا ، حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی ، سەرباری هەمو جۆرە دەردو شکەنجەو ئازارێك و سەرەرای سەختی ئەو بارودۆخەی کە روبەرووی هات ، توانی بەردەوام و بەجەرگانە مەشخەڵی تێکۆشان ، لەبەر

• کاتێکیش کە ئەم حیزبە پێشەنگە ، شۆرشی ١٧ – ٣٠ تەموزی پیرۆزی لەعیراق بەرپاکرد ، روو بەرووی گەلیٚ تەنگ وچەڵەمەی نێو مەیدانی راهێنانی

رۆشتابی چارەسەرێکی زانستیانەی رووندا بهێنیتە کایەوە وبۆ ئەم مەبەستەیش هەزاران قوربانی بدات و بەدڵسۆزیەوەیش باری گرانی لیٚ پرسینەوەی مێژوویی و لەپێناوی نەتەوەی عەرەبا بگرێتەئەستۆ . .



فیعلی ئایدیۆلوژیەکەی هاتو ئەبوایە دەوری پێشەنگانەی خۆیو ناسنامە دیارەکەی خۆیو ئامانج ودروشمە ئاشکراکانی خۆی بۆ کۆمەلانی خەلکی ئەم ولاتە ساغ بکاتەوە . . ئەوە بوو ئەوەندەی پێ نەچوو ، قوڵی مەردانەی لێ هەلمالی و بەوپەری تواناوە – سەرباری بارودۆخە ئالۆزەکەیشو سەرباری هەولی هەلگەرانەوەو پیلانگێرانیش – بەبەلگەوە ئەو راستی‌یەی نواند کە : ئەم حیزبە لەئاستی لێپرسینەوەی خۆیایەتی‌و تۆزقالێ چیە شانی خۆی لەبەر لانادات . . ئەمیش لەبواری ئەو لیستە درێژەی گشت دەسکەوتو سەرکەوتنە بەرزانەی کە بەدی‌هیناو بەمەیش ئەوەی سەلماند کە بەراستی حیزبی شۆرشی هاوچەرخانەی چەماوەرە . . نەك هەر تەنها بۆ رابەری‌کردنی رەوتی شۆرشە نەمرەکەی عیراقو بەس ، بەلکو بۆ ئەوەی لەپێشی پێشەوەی سەرجەمی جولانەوەی عەرەبی‌دا بێت . .

• بیروباوەرەکانی ئەم حیزبەو گیانی نەمری شۆرشی ١٧ – ٣٠ تەموزو شان‌بەشانی ئەو بنیادنانە چەسپاو شۆرشگێرانەیەی کە ئەمرۆ گەلی عیراق پشتی پێ بەستوەو لەپالیا ژیانی تازەی خۆی رەنیو ئە هێنێو بەرەو پاشەرۆژێکی روناك هەنگاوهەلئەهێنێ ، ئا ئەم بیروباوەرو گیانو بنیادنانە بووە هۆی ئەوەی کە عیراق بەسوپاو گەلەکەیەوە ، روبەرووی کاری دوژمنانەی فارسی رەگەزپەرست بێتەوەو لەقادسیەی ئەمرۆی‌دا ، قادسیەی نەمری صدام‌دا ئەو راستی‌یە ئیسپات بکات کە ئەم سوپاو گەلە بەوپەری هێزو تواناوە . بەوپەری دلسۆزی‌و مەردی‌یەوە . بەئاشکراو بێ پێچو پەنا بەرگری لەمافی رەوای خۆی بکاتو بەگژ خواستی نارەوای بێگانان بچێتەوەو پاسەوانی لەرەوتو پاشەرۆژی خۆی بکاتو هەمو جۆرە هەولێکی نامرۆڤانە رەت بکاتەوەو هەمو چەشنە پیلانێك لە گۆر بنێ . .

• سەرکەوتنی گەلی عیراق لەقادسیەی نەمری صدامدا ، لەئەنجامی بیروباوەرە پاکەکانو لەگیانی پاکی گەلو لە بروای



بەوی گەلەوە بەعەدالەتی کێشەکەو بە پیرۆزی جەنگەکەمانەوە هەیەو سەری هەڵداوە . . بێگومان ئەم گەلەی ئێمە ، هەمیشەو بێ‌وچان ، بەگیانی لەخۆبوردن‌و فیداکاری‌یەوە ، سەیری ئەم کێشەیە ئەکات · وبڕوایەکی لەبن نەهاتوویشی بەرۆژی سەرکەوتنی یەکجارەکی هەیە .

• هەر لەم بۆنە پیرۆزەیش‌دا ، بۆنەی سەرهەڵدانی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی ، زۆر لەبارەو پێویستیشە ئەوە بڵێین کە : سەرلەبەری کۆنە رژێمەکانی عیراق ، هەر لە رۆژی دامەزرانی (حوکمی نیشتمانی !)یەوە تا بەرەبەیانی شۆرشی (١٧)ی تەمووزی ساڵی ١٩٦٨ ، یەك دوای یەك جەزرەبەی میللەتی سەرفرازی کوردیان داوە و ئەوەی پی‌یان کرابێ لە دژی ، کردویانەو درێغیان نەکردوە و مەسەلە نەتەوایەتیەکەیشی هەروا ماوەتەوە و زیاتریش ئاڵۆز بووە ، کەچی لەگەڵ بەرپا بوونی شۆرشی ١٧ – ٣٠ تەموزی نەمر وکاتێ کە حیزبی بەعسی جڵەوی کاری گرتە دەست ، لەپێودانگێکی مرۆڤانەو زانستیانەوە روبەرووی «کێشەی کورد) بوەوە و بەگیانێکی برایانە ددانی بەگشت مافە رۆشنبیری ونەتەوایتیەکانی کوردەوە ناوچڵەپۆیەکەی گەیشتە بەیاندامەی مێژوویی (١١) ئادارو جاردانی ئۆتۆنۆمی بۆ ناوچەی کوردستان . . بەمەیش بۆ یەکەم جار لە مێژوودا ، ددان بەبوون و مافە رەواکانی گەلی قارەمانی کوردەوە نرا و هەم کوردو هەم سەرجەمی گەلی بەشەرەفی عیراقیش کەوتنە نێو قۆناغێکی تازە ترورە هاترەوە . .

• سلاوی پیرۆز بابی لە یادی (٣٥) ساڵەی دامەزرانی حیزبی سەرکردە ، حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی . .

• سلاوی وەفادرای‌ی ، بۆ گیانی پاکی شەهیدانی رێگای رزگاری وپاشە رۆژ . .

• سلاوی خۆشەویستی و شانازییش ، بۆ سەرۆکی تێکوشەر صدام حسین ، لەم بۆنە پیرۆزەدا . .



# لە یادی
# لە دایکبوونی
# حزب و
# دەستکەوتە
# گەورەکانی



حەوتی ئەم مانگی نیسانە (٣٥) ساڵ بەسەر یادی دامەزراندنی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستا تێدەپەڕێ ، لەبەر ئەوەی کە ناتوانین لەم ووتارە کورتەدا هەموو ئەو دۆخ و شتانە بهێنینەوە کە ئەم حزبەی تێدا درووست بوو ئەو شتانەی کە تا ئەمڕۆ وەدیی هێناوون باسی بکەین ، تەنیا بەوە دەستهەڵئەگرین کە ئەنجامی کارو ڕەفتاری ئەو ڕووداوانە نەهاتۆتەکایەوە کەوا زۆر کۆننین بگرە تێگەیشتنێکی قووڵی مێژووی نەتەوەیە لەو سەرکەوتنانەی کە ئەم مێژووە بەخۆیەوەی بینیوە .



ئەوەی کە ئەبێ هەمیشە باسی بکەین ئەوەیە کە ڕەسەنایەتی ئەم حزبە لە سەرەتای درووستبوونییەوە بەرامبەر بە باری نەتەوایەتیو مرۆڤایەتیو ئەو کارە پرشنگدارانەوە کە کردوونی دەربخەین. بەتایبەتی پاش شۆڕشی (١٧ - ٣٠)ی تەموز کە لە عیراقدا کاری گرتە دەست حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست لەو بیروباوەڕە بەرزەوەی کە هەیەتی بەرامبەر بە ئازادبوونی نەتەوەی عەرەبو پێشخستنی نیشتمانی عەرەب لە هەموو ڕوویەکەوە دژی ئیمپریالیزمو پشتگرتنی وولاتانی بێلایەنو یارمەتیدانی ئەو گەلانەی کە ژێردەستەنو عەرەب نینو ئەو وولاتانەی کە ئازادبوون. حزبی بەعسی عەرەبی دەستی خستە ناو دەستی ئەو گەلانەی کە دژی ژێردەستەبیو کۆیلەیینو بە هەموو تواناوە یارمەتی ئەدان بۆ ڕزگاربوونو سەرفرازی ، بەتایبەتی یارمەتی گەلی عەرەبی فەلەستین دژی زایۆنیزمو ئیستعمارو بۆ گەڕانەوەی مافی زەوتکراویان.

لە ناوخۆی عیراقیشدا لەسەر ئەو بیروباوەڕەی کە ئەبێ گەلی عیراق بە کوردو عەرەبیەوە بژینو هەر گەلە مافی نەتەوەییو ڕۆشنبیریو کۆمەلأیەتی خۆی هەبێو جیاوازی نەکرێ لەنێوان نەتەوەیەکو نەتەوەیەکی تردا ، بێجگە لەوەی کە جەماوەری عیراق بە هەموو نەتەوەکانییەوە لەڕووی خوێندەواریو ئابووریو سیاسیو کارکردنەوە لەڕووی تێگەیشتنی بەکارهێنانی پێویستییەکانی سەرشانیانەوەو پێشخستنی باری پیشەسازیو ئابووری ئاوەدانکردنەوەی وولأتەوە زۆر پێشکەوتن لەگەڵ ئەمانەشدا گەلی ڕێکخراوو نیقابەو یەکێتیو حزبی سیاسی ڕێگەیان درا کە بە ئاشکرایی ئیشبکەن ، هەروەها حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست بەپێی بیروباوەڕەکانی ئابووری وولأتی بە تەواوی لە دەستی بێگانە سەندەوەو نەوتی خۆماڵیکردوو بە سەدان پرۆژەی پیشەسازیو کشتوکاڵیو ڕۆشنبیری لە عیراقدا کردەوە. هەروەها مافی ئافرەتی داو ، مافی کرێکارو جووتیاری داو بە کورتییەکەی لە هەموو ڕوویەکەوە وولأتی عیراق بە گەو خاکەوە تەواو پەرەیانسەند.

شایانی باسە لەو گیانەوە کە حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست بەرامبەر بە مافی هەموو نەتەوەیەك هەیبوو گەلی کوردمان جگە لەوەی لە هەموو بوارێکی ئابووریو ڕۆشنبیریو سیاسیو کۆمەلأیەتییەوە هەموو مافێکی درابوویەو بە سەدان پرۆژەو دەزگای ڕۆشنبیریو کارگەی پیشەسازیو ڕێگای هاتوچۆو ئاوەدانکردنەوەو پەرەپێدانو قەلاچۆکردنی نەخوێندەواریو پێشخستنی کشتوکاڵو دروستکردنی چەندان بەستو ڕاکێشانی جۆگە بۆ سەر

کشت‌وکاڵ‌و یارمەتی‌دانی جوتیاران کەرەسەی پێویستی زەوی کێلان‌و نەهێشتنی ئافات‌و هاندانی بەخێوکردنی ماڵات‌و پەروێندانی باری تەندروستی‌و پاراستنی کەلەپوری بەخۆیەوە دی لەگەڵ ئەمانەشدا لەسایەی شۆرشی (١٧–٣٠)ی تەموزدا ئۆتۆنۆمی دەستیگیربوو جەژنی نەورۆزیش کرا لە جەژنێکی رەسمی.

گومان لەوەدا نیە کە ئەم کارانە هەموو لەسەر بنەرەتی بیروباوەرەکانی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستە بۆ قوڵ‌کردنەوەی گیانی برایەتی کوردو عەرەب لە چوارچێوەیەکی رەوای ئەوتۆدا کە هەموو کەسێك لەعیراقدا وا هەست‌بکات سەربەستەو مافی رەوای خۆی هەیەو رێگەی خوێندن‌و کارکردن‌و هیچ شتێکی کەڵکداری لێ نەگیراوە کە بیکات.

لەم رێگەیەوە چ ئافرەت چ پیاو چ کرێکار چ جوتیار چ موچەخۆرو کاسب‌کار منداڵ‌و گەورە بۆ پێشکەوتنی زیاترو بۆ پەرەسەندنی زیاتری بەختیاری‌و ئاوەدانی گەل‌و وڵات هەرەیەکە لە کارەکەی خۆیدا زیاتر تەقەللای دڵسۆزانە ئەدات‌و زیاتر خۆی ماندوونەکات بۆ لەدەست نەچوونی ئەو دەستکەوتە نایابانەی کە دەستی کەوتوون لەبەر.ئەوە پڕ بە خواستی ئەیەوێ بەرهەمی باش بەدەستەوە بدات‌و ئەو بەرهەمەشی کە وەدی‌ئەهێنێ ئەبێ جار لەگەڵ جار زیاتری بکات.

بەم جۆرە گەلی کورد وەك گەلی عەرەبی برای‌و وەك کەمە نەتەوەی‌یەکانی تر لەسایەی سەرکەوتنی بیروباوەڕو شۆڕشی (١٧ – ٣٠)ی تەمووزی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستەوە بۆ پێشکەوتن بەوپەڕی دڵسۆزیەوە پشتی گیراو لە هەموو روویەکەوە یارمەتی درا. ئەمڕۆش گەلی کورد، رۆڵە نەبەردەکانی شان‌بەشانی برا عەرەبەکانیان لە بەرەکانی جەنگدا دژی فارسی رەگەزپەرست بۆ پاراستنی سەربەخۆیی‌و سەندنەوەی خاك‌و ئاوی زەوت‌کراومان‌و بۆ پاراستنی ئەو برایەتی‌و دەستکەوتە مەزنانەی کە لەسایەی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستەوە دەستی کەوتووە ئەجەنگێ‌و لە دەوری سەرکردایەتیە دڵسۆزەکەی لە سەروو هەموویانەوە هەڤاڵ صدام حسین کۆبوونەتەوەو بەوپەڕی تواناوە قوربانی ئەدەن.

هەربژی یادی (٧)ی نیسان
یادی لەدایك‌بوونی حزبی
بەعسی عەرەبی سۆشیالیست



# ڕێکەوتن لە زماندا

دکتۆر وریا عمر أمین . زانستگای بەغداد – کولێجی پەروەردە
بەشی کوردی

لە گەلێ زمانانداد . . هەندێ لە بەشەکانی ڕستە لەگەڵ یەك ڕێك دەکەون لە ڕووی یەك یا زیاتر لە چەمکی گرامەری‌ی وەك کەس Person ، ژمارە Number ، جنس Gender و حاڵەت Case . ئەم ووتارە هەوڵدانێکە بۆ پێشاندانی سروشتی ڕێکەوتن Agreement لە زماندا بە گشتی و شوێنی زمانی کوردی لە ناو سیستەمی ڕێکەوتندا .

١ – کەس : یەکەم و دووەم و سێیەم دەس نیشان کراون .

أ – یەکەم – قسەکەر دەگرێتەوە (من ، ئێمە ، و هەموو ئەو ووشانەی دەتوانن لە ڕستەدا جێیان بگرن) .

ب – دووەم – قسە بۆ کراو دەگرێتەوە (تۆ ، ئێوە ، و هەموو ئەو ووشانەی دەتوانن لە ڕستەدا جێیان بگرن) .

ج – سێیەم – قسە لەسەر کراو دەگرێتەوە (ئەو ، ئەوان ، و هەموو ئەو ووشانەی دەتوانن لە ڕستەدا جێیان بگرن) .

٢ – ژمارە : لە ژمارەدا تاك Single و جووت dual و سێ‌یی Trialو کۆ Plural دەس نیشان دەکرێت .

تاك : ئەوەیە ووشەکە لە ڕووی چەمکی سیمانتیکی‌یەوە ئیشارەت بێ بۆ تاکە شتێ یا کەسێ . (بەرد ، تۆ ، ئەو . .) . لە هەندێ زمانانداکۆ لە دووەوە دەس پێ دەکات وەك لە زمانی کوردی‌و تورکی و ئینگلیزی .

| | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| کوردی | من | ئێمە |
| تورکی | ben | biz |
| ئینگلیزی | I | We |

لە هەندێ زماندا کۆ لە (سێ) وە دەس پێ دەکات وەك لە زمانی عەرەبی و سەنسەکریتی و چەند زمانێکی سلۆڤانیکی . واتا لەم جۆرە زمانانە لە ڕووی ژمارەوە تاك و جووت و کۆ دەس نیشان دەکرێن .

| تاك | جووت | کۆ |
|---|---|---|
| ولد | ولدان | اولاد |
| انت | انتما | انتم |

زمانی واش هەیە کۆی لە چوارەوە دەس پێ دەکات . واتا لەم جۆرە زمانانە تاك و جووت وسێ‌یی و کۆ دەس نیشان دەکرێن . وەك لە زمانی فیجینی Fijian و تیگری Tigre . [1] .

٣ – جنس : سێ جۆر جنس لە زماندا دەس نیشان کراوە .

أ – نێرینە Masculine

ب – مێینە Feminine

جـ – بێ‌لایەن Nuter

زمانە جیاوازەکانی جیهان جیاوازی پێشان دەدەن لە ڕووی هەبوون و نەبوون و چۆنیەتی دەرکەوتنی جنس تێیاندا لە هەندێ زماندا جنس هیچ جیا ناکرێتەوە وەك لە زمانی تورکی . زمانی واش هەیە لە هەندێ شوێنیدا جنس جیا دەکرێتەوە وەك لە زمانی ئینگلیزی‌کە تەنیا لە ڕاناودا جیا دەکرێتەوە [he – نێرینە ، she – مێینە – it بێ لایەن] هەموو ئەمانە مانای (ئەو) دەگەیەنن .

لە کوردیی خوارووشدا لە نیدادا Vocative نەبێ جنس جیا ناکرێتەوە . [کورە ، مامە ، بەرامبەر کچێ پووری] .

لە هەندێ زماندا نیرێنە و مێینە جیا دەکرێنەوە وەك لە زمانی عەرەبی .

| نیرێنە | مێینە | |
|---|---|---|
| هو | هی | (ئەو) |
| کاتب | کاتبە | (نووسەر) |

هەندێ زمانیش لە ڕووی جنسەوە ووشەکانی دابەش ئەبنە سەر نێرینە و مێینە و بێ لایەن وەك زمانی ڕووسی .

| نیرێنە | مێینە | بێ‌لایەن |
|---|---|---|
| Titrad | Kniga | Akno |
| دەفتەر | کتێب | پەنجەرە |

Mesto Karta Sto

مێز خەرینە شوێن

٤ – حاڵەت : لە هەندێ زماناندا دەور لە ڕستەدا شێوەیەکی تایبەتی بەووشە دەبەخشێ پێ ی دەووترێ حاڵەت (ـر) . بۆ نموونە لە زمانی عەرەبی ئەگەر ناو دەوری فاعلی Subjective بینی لە حاڵەتی مەرفووعیدا Agentive دەبێ . کە نیشانەکەی ئەوەیە پێ ی دەووترێ (ضمە) . گەر ناوەکە لە دەوری مەفعوولیدا بوو ئەو لە حاڵەتی مەفعوولیدا Objective دەبێ و نیشانەکەی ئەوەیە کە پێ ی ئەووتری (فتحە) . . هتد .

زمانانی جیهان جیاوازن لە ڕووی پێشاندانی ئەم حاڵەتانە . زمانی فنلەندی Finish (١٥) حاڵەتی هەیە . ڕووسی (٦)ی هەیە . لە ئنگلیزیدا (٣) هەیە ئەویش تەنیا لە ڕاناودا .

## جۆرەکانی ڕێکەوتن

لە هەندێ زماناندا ، لە ناو چوار چێوەی بەشە بنجییەکانی ڕستە (ناو) کە بە (ناووك)ی head بەشەکە دەژمێررێت لە چ کەس ، ژمارە ، جنس یا حاڵەتێکدا بێ ، ئەو ناوی ئیشارە و ئاوەڵناو (یا ئاوەڵناوانە)ی لە گەڵیشیدا دەردەکەون سەر بۆ هەمان کەس ، ژمارە ، جنس یا حاڵەت دا دەنوێنن . بۆ نموونە لە زمانی عەرەبیدا ، لە ڕستەی :

جاء الولَدُ [کوڕەکە هات]

ووشەی (الولَدُ) ناوە دەوری فاعلی بینیوە لە حاڵەتی (مەرفوعی) دایە ، نیشانەکەی ئەو (ضمە)یەیە کە لە دوایدا دەرکەوتووە . لە ڕووی ژمارەوە (تاك)ە و لە ڕووی جنسەوە (نێرینە)یە . گەر ناوی ئیشارە یان ئاوەڵناوێ (یانزیاتر) یان هەموو ئەمانەی بە یەکەوە لە گەڵدا دەرکەوت ، ئەمانیش سەر بۆ هەمان ژمارە و جنس و حاڵەت دادەنوێنن .

جاء هذا الولدُ الذکی

لە ڕستەی :

رأیت البنتین .

ووشەی (البنتین) ناوە دەوری (مەفعوولی) بینیووە لە ڕووی ژمارەوە (جووت) ە لە ڕووی جنسەوە (مێینە) یە . گەر ناوی ئیشارە یان سیفەیێ (یان زیاتر)ی لە گەڵدا دەرکەوت . ئەمانیش سەر بۆ هەمان ژمارە و جنس و حاڵەت دادەنوێنن .

رأیتُ هاتین البنتین الذکیتین الجمیلتین .

لە هەندێ زماناندا ڕێکەوتن لە ناو چوارچێوەی بەشە بنجییەکانی ڕستە تەنیا لە نێوان ناو و ناوی ئیشارەدا دەردەکەوێ . ئەویش تەنیا لە ژمارەدا . وەك لە زمانی ئینگلیزیدا .

This beatiful girl came

ئەم کچە جوانە هات

These beatiful girls came

ئەم کچە جوانانە هاتن .

ئەم وێنەیە چەمکی ڕێکەوتن لە ناو چوارچێوەی بەشە بنجییەکانی ڕستە ڕوون دەکاتەوە .



(س) ئیشارەتە بۆ یەکێ یان زیاتر لەمانە (کەس – جنس – ژمارە – حاڵەت)

(+) ئیشارەتە بۆ ئەوە زمان هەیە تەنیا ناوی ئیشارە تێیدا لەگەڵ ناودا ڕێك دەکەوێ . زمانیش هەیە ناوی ئیشارە و ئاوەڵناو لەگەڵ ناودا ڕێك دەکەوێ .

ئەو جۆرە زمانانەی ڕێکەوتن تەنیا لە ناو چوار چێوەی بەشە بنجییەکانی ڕستەی هەیە لێرە بە جۆری (A) لە قەڵەم دەدەین . وەك لە زمانی ئینگلیزی .

ئەوەی تا ئیستا باس کرا ڕێکەوتن بوو لە ناو چوارچێوەی بەشە بنجییەکانی ڕستە . جۆرێکی تر ڕێکەوتن هەیە ئەویش ڕێکەوتنە لەنێوان بەشە بنجییەکانی ڕستەدا . بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە (بکەر) و (بەکار) و (فرمان) وەك سێ بەشی بنجیی ڕستە جیا دەکەینەوە .




زمان هەیە تێیدا (بکەر) و (فرمان) ڕێك دەکەوێ . وەك لە زمانی تورکی‌یدا بکەر و فرمان لە کەس و ژمارەدا ڕێك دەکەون .




ئەو زمانانەی ڕێکەوتن لە نێوان (بکەر) و (بەرکار) دا پیشان دەدات بە جۆری (C) لە قەڵەم دەدەین .

زمانی وا هەیە ڕێکەوتن تێیدا لە نێوان (بەرکار) و (فرمان) دا دەردەکەوێ . وەك زمانی باسك . کرمانجی‌ی ژووروش لەکاتی ڕابردوو بەر ئەم جۆر زمانانە دەکەوێ .




ئەو زمانانەی ڕێکەوتن تێیدا لە نێوان بکەر و فرماندا دەردەکەوێ بە جۆری (B) لە قەڵەم دەدەین .

زمان هەیە (بکەر) و (بەرکار) تێیدا ڕێك دەکەون . وەك زمانی سنهالی Sinhalese [٢] کوردی‌ی (خوارووش) لە ڕابردوو ئەم دیاردەیە پیشان دەدات .




(من ئێوەم دیت)

ئەو زمانانەی ڕێکەوتن تیاندا لە نێوان بەرکار وفرماندا دەردەکەوێ بە جۆری D) لەقەڵەم دەدەین . ئەم جۆرە زمانانە . لە زانستی زماندا بە Ergative ناو براون .

جۆرەکانی ڕێکەوتن هەموو لە یەك وێنەدا ڕوون دەکرێتەوە .




س ئیشارەت بۆیەکی یا زیاتر لەمانە [کەس ، ژمارە ، جنس ، حاڵەت)

لە گەڵێ زماناندا زیاتر لە یەك جۆر ڕێکەوتنیان تێدا دەردەکەوێ . بۆ نموونە : زمانی عەرەبی جۆری A) و (B) پێشان دەدات لە هەموو بارێکدا واتا بە پێی ئەم لێکۆڵینەوەیە زمانێکی (AB) یە .

لە زمانی ئینگلیزی جۆری (A) ی هەیە تەنیا لە نێوان ناو و ناوی ئیشارەدا دەردەکەوێ و جۆری (AB لەگەڵ کاری بووندا (Verb to be) و کە بکەر لە کەسی سێیەمی تاکە لە کاتی داهاتوو .

I am a student

من قوتابیم

We are students

ئێمە قوتابین

He goes at eight oclock سەعات (٨) ئەڕوات

بەم جۆرە زمانی ئینگلیزی جۆری (A) (B) پێشان دەدات .

Aو B خراونەتە ناو دوو کەوانەوە مانای ئەوە دەگەیەنن بە تەواوی A و B نی یە .

بەم جۆرە و بە پێی ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆمان دەردەکەوێ کە کرمانجی ی خواروو و کرمانجی ژووروو دوو سیستەمی جیاواز لە ڕووی ڕێکەوتنەوە پێشان دەدەن .

کرمانجی ی خواروو جۆری (B (C یە .

کرمانجی ی ژووروو جۆری (A (D یە .

## پەراوێزەکان

١ – زمانی فیجینی سەر بە بنەماڵەی (مەلایۆ – پۆلینییەن)ە . لە یەکێ لە دورگەکانی ئۆقیانۆسی پاسفیکی قسەی پێ دەکرێت .

زمانی تیگری زمانێکی سامی یە لە باکووری ئەسیووپیا قسەی پێ دەکرێ .

٢ – زمانی سنهالی سەر بە گرووپی (ئیندیك)ە Indic ، کە سەر بە بنەماڵەی هیندو ئەورووپی یە . لە دوورگەی سری لانکە قسەی پێ دەکرێ .

## سەرچاوە

1 – Lewis ( G.L. (1978) Turkish
Hodder and Stoughton

2 – Lyons, J. (1968) Introduction to theoretical Lingnistics
Cambridge University Press

3 – Palmer, F.(1972) Grammar Pelican

٤ – وریا عمر أمین (١٩٨١) نموونەێك جیاوازی لە نێوان کرمانجی ی خواروو و ژووروودا . گۆڤاری کولێجی ئەدەبیات – زانستگای بەغداد ژ (٢٤) .

کتێبی (رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز

# لەگەڵ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە دیالیکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیداو سینتاکس

غازي فاتح ويس

**پێشەکی : (Introduction)**

لەم ساڵانەی دواییدا ، زانستی لینگویستك بەشێوەیەکی یەجگار خێرا پەرەی‌سەند . ئەم پەرەسەندنەش بەجۆرێك روویدا کە هەرگیز لە مەزاری هیچ زانستێکدا رووی نەدابێ . تا رادەیەك باری ماتەماتیکی بەخۆیەوە نا . بەگوێرەی ئەو پەرەسەندنە ، ئەگەر ئێستا بەراوردی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە دەربارەی زمانی کوردیمان کراوەو لەگەڵ ئەو لێکۆڵینەوە زانستیانەی کە لە ئەورووپای رۆژئاوادا کراون بکەین ئەوە بێ‌گومان بەزەیمان بە زمانەکەماندا دێ کە چەند ، لە لایەکەوە بێ ناز ماوەتەوەو لە لایەکی کەوە چەند هەڵەو گۆڕانو زیادکردنو لێ کەم‌کردنی نابەجێی بەسەردا ئەهێنرێو هێنراوە .

زمان بە شێوەیەکی جوانو رێك‌وپێك دابەش‌کراوەو هەر بەشێکی لە ئاستی خۆی شی‌کراوەتەوە کە ئێستا ئێمە ئاگاداری نین‌و بگرە ماوەیەکی زۆری ئەوێ بگاتە ئێمە . چەندەیا توێژی تازەو پوخت لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ئەدۆزرێتەوەو کاری لەسەر ئەکرێو زمان پێی ئەگەشێتەوەو پایەی زانستی زمان لەناو زانستەکانی تردا پێی بەرز ئەبێتەوە .

تا ئێستا گرامەری کوردی لەنێوان گرامەری عەرەبیو ئینگلیزیدا گیرماوەوو گرامەر نووسەکانی کورد بەدیاریەوە دۆش داماوون . لە لایەکی کەوە گرامەری رووسیش هاتۆتە پاڵو ئەوا بوو بە سێ گرامەری بەخاوەن‌و گرامەرێکی بێ خاوەن‌و پەلەقاژێی بۆئەوەی نەکەوێتە گۆماوێکی لێلی قوراوییەوە . هەر شتێکیش ئەگەر خاوەنی هەبوو ئەوا گومانی تێدا نییە ناروخێو ئەوەی بێ خاوەنە هەر کزوسیس ئەمێنێتەوە . گرامەری کوردی ، چونکە لەسەر ئەساسی گرامەری زمانەکانی کەوە ئەنووسرێتەوەو باس‌ئەکرێ بۆیە وەکو کۆڵەکەیەکی بێ ئەساس هەمیشە لە روخاندایەو دووبارە دائەمزرێتەوەو ئینجا ئەروخێتەوە .

جارێکی کە تائێستا ئەوانەی لە دەرەوە بە زمانو زمانەوانییەوە خۆیان خەرك‌کردووە هەوڵی ئەوەیان نەداوە بزانن ئایا گرامەری کوردی لە گرامەری کام زمانەوە نزیکەو لەگەڵیدا تۆزێك شانبەشان ئەروات ، بۆئەوەی بتوانرێ لە لایەکەوە سەری رێگەیەکی راست‌و بەجێو رەوان بدۆزنەوەو بکەونە لێکۆڵینەوەی زمانەکەمانو ئینجا گرتنی ئەو رێچکەیە بۆ بنیات‌نانی گرامەری کوردی .

لە هەمان کاتدا مەرج نییە بۆ وێنە زمانی کوردی چونکە لە زمانی فارسییەوە نزیکە ئیتر یەك شێوە گرامەریان هەبێ . هەر بۆ نموونەش دیالیکتی بادینیو سۆرانی لە هەندێ رووەوە لەیەك ناچن وە ئەمەش نابێتە هۆی ئەوە کە بووترێ بادینیو سۆرانی یەك زمان نین‌و بنەرەتیان یەك نییە .

با بێینە سەر ئەوەی کە ئایا گرامەری عەرەبی شێوەکەی بۆ گرامەری کوردی ئەشێ . بۆ نموونە ئەگەر تەنیا سەیری ستراکچەری رستە بکەین لە زمانی عەرەبیداو بەراوردی لەگەڵ ستراکچەری رستەی زمانی کوردیدا بکەین ئەوا زۆر بەئاسانی بۆمان دەرئەکەوێ کە شێوەی شی‌کردنەوەو ستراکچەری ئەم دوو زمانە عاسمانەو رێسمانو ئەوەی زمانی عەرەبی بۆکوردێکە ناشێ . رستە لە زمانی عەرەبیدا ئەبێتە رستەیەکی تەواو ئەگەر ئەو رستەیە بریتی بوو لە (مبتدأو خبر) وەیا لە ناوێك‌و ئاوەڵناوێك . بەڵام لە زمانی کوردیدا ئەمە ناگونجێ . لە زمانی ئینگلیزیدا رستەیەك نابێتە رستەی تەواو ئەگەر فرمانی لەگەڵدە نەبێ . واتە ئەوەی بۆ عەرەبی ئەشێ بۆ زمانی کوردی ناشێ چونکە رستەی زمانەکەمان بەو شێوەیە دروست ناکرێت . ئەی ئەوەی ئینگلیزی ؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەڵێین : تا رادەیەك شێوەی شی‌کردنەوەی گرامەری ئینگلیزی لەگەڵ کوردیدا ئەشێ بەڵام هەمیسان تەنگ‌وچەڵەمەی فرمانمان تووش‌ئەبێ چونکە بۆ نموونە ئەگەر وترا :

منالّەکە جوانە .

ئەوا ئەبێ فرمانی تێدا هەبێ ئینجا ئەبێتە ڕستەیەکی تەواو . وە ئایا (ە) ئەبێتە فرمان یا نەء ؟ بەڵێ لەکۆنەوە وتراوە کە گوایە ئەم (ـە) یە فرمانێکی بێهێزە وەیا نیمچە فرمانە . بەڵام نیمچە فرمانیش بەگوێرەی زانستی زمان شتێکی زۆر بەجێ نییە . ئەگەر بەگوێرەی وێنەی دایەگرامی سینتاکس بێ (وەیا لقوپۆپی درەختی سینتاکس بێ) (Tree Diagram) ئەوا ئەو ڕستـــەیـــە بـــەم جۆرەیـــە ئەبێ :

S Sentence

NP Noun Phrase.

P Verb Phrase

Art Article

Adj Adjective

لە ئینگلیزیدا ئەوا بە جوانیو ئەبێ فرمانەکەی تێدا هەبێ :

The Child is beautiful

بەڵام لە عەرەبیدا بەبێ فرمانە :
الولدُ جميلٌ . گرنگ ئەوەیە ئێمە لە لێکۆڵینەوەی زمانەوانیدا یا ئەگەر باسی گرامەری کوردیمان کرد نابێ پڕبەپڕ لاسایی گرامەری زمانێکی تایبەتی بکەینەوە بەڵام گرنگ ئەوەیە سوودی لێ وەربگرینو بزانین تا چی ڕادەیەك تاقیکردنەوەی دانانی گرامەری کوردی قشەنگو پوخت دەرئەچێ . وە ئەگەر لەم ڕووەوە بدوێین ئەوا زور ئەخایەنێو زورتر لە باسەکەی خۆمان ئەچینە دەرەوە .

**لێکۆڵینەوە :**

زیاتر ئەم دوو سێ دێرە لە کتێبی (ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز لەگەڵ ڕستەی . . . هتد)ی کاك ئیبراهیم عەزیز کە دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی بۆی لەچاپ داوە وای لێکردم ئەم وتارە بنووسمەوە . ئەم دوو سێ دێرەش ئەمانەی خوارەوەن :

**(وە هەروەها بۆ ئەوەش ، کە بەڕێزان نووسەرانی ڕێزمان هاوکاریم بکەن لە دانانی ڕێزمانێکی زانستی تەواو بۆ زمانی کوردی ، کە ئەم کارە بەردی بناغەی سووچێکیەتی لەگەڵ بەردی بناغەی ئەوان تەلاری بەرزو قەشەنگی ڕێزمانی کوردی دروست بکرێت)** ل ٧ - ئینجا ئەڵێ :

( . . . هەمو پرسیارەکانی سینتاکسو گراماتیکی زمانی کوردی چارەسەر بکەمو کتێبی گەورەی ڕێزمانی کوردی بنووسم بە فۆنەتیكو مرفۆلۆگیاو سینتاکسەوە . . . ل ٢٣)

پێش هەمو شتێك ئەبێ دان بەوەدا بنێم کە کاك ئیبراهیم لەگەڵ ئەو کتێبەدا زۆر ماندووبووە ، هەر نەبێ بە درێژای (٤) ساڵ خۆی پێوە خەریككردووە بۆئەوەی شەهادەی (کاندایدات)ی پێ وەربگرێ (Candidate) و ئینجا هەرنەبێ بە دوو مانگیش وەریگێڕاوەتە سەر کوردی ئەمەش کارێکی ئاسان نییەو مەگەر هەر ئەو توانیبێتی بیکات .

یەکەم ئەگەر . خۆی بتوانێ هەموو لایەنەکانی زمانی کوردی زیندووبکاتەوە (وەکو خۆی ئەڵێ) و بینووسێتەوە ئیتر هاریکاری ئێمەی بۆ چییە ؟ . بەڵام بەداخەوە ئەگەر ئەو شارەزاییەکی تەواوی دەربارەی فۆنەتیك وەیا فۆنۆلۆژی وەیا . ڤۆلۆژی هەبوایە نەیدەگووت :

(لێرەشدا لە لاپەرە (٢٢ ، ٢٣) لەبارەی (ی)قسەی کردووەو دەڵێت (مەبەستی نامەی دوکتۆرای کاك وریاو کاك وریا خۆیەتی ئەم (ی)یە مۆرفیمە» ئینجا ئەڵێ : (بەڵێ راستە مۆرفیمە گەر باس باسی فۆنۆتێك بێت بەڵام گەر باس هاتە سەر سینتاکس ئەم (ی) یە بە مۆرفیم ناهێتە پاسکردن . . . ل ٢٢)

بەلام (ی) ، ئەگەر فۆنیم بێت وەیا مۆرفیم ، ناکەوێتە سنووری فۆنەتیکەوە کەوا کاك ئیبراهیم ئەڵێ . چونکە فۆنەتیك زانستێکە لە چۆنیەتی دروستبوونی دەنگ ئەکۆڵێتەوەو دەیان جیهازی ووردو نایابو بەکەڵك بۆ ئەم مەبەستە دروستکراوە .

وە ئەگەر (ی) مۆرفیم بێ ئەوا ئەکەوێتە نـاو سنووری مۆرفۆلۆژیـــیەوە (Morphology) وەئەگەر فۆنیم بێت ئەوا ئەکەوێتە ناو سنووری فۆنۆلوژیەوە (Phonology) وە ئەگەر دەربارەی چۆنیەتی دروستبوونی (ی) بێت لەناو دەمو قورگدا ئەوا ئەکەوێتە ناو سنووری فۆنەتیکەوە (Phonetics) . کاك وریا مەبەستی لە مۆرفۆلوژی‌و سینتاکسە بە تێکرا . وە نامەی دوکتۆر ییەکەی کاك وریا کە کاك ئیبراهیم ناوی بردووە ئەتوانرێ بکرێ بە بەردی بناغەی سینتاکس بۆ زمانی کوردی وە ئەوە نییە کە کاك ئیبراهیم ئەڵێ :

(لەبەر ئەوە کارەکەی کاك وریا تارێکی سەرپێیە لەعاست سینتاکسی زمانی کوردیەوە) ئەم هەڵوێستەش وابزانم ئەگەڕێتەوە سەر ئەوەی کە ڕەنگێ کاك ئیبراهیم یا باش نامەی دوکتۆراکەی کاك وریای نەخوێندبێتەوە وەیا لەبەر باش نەبووڵی ئینگلیزیەکەی بێ . بەلام کاکی ناوبراو سەرچاوەی ئینگلیزی زۆر بەکارهێناوە چونکە لە کتێبەکەیدا دیارە .

وەیا بە بەراوردکردنی ئەو نامەیە لەگەڵ سەرچاوە روسیەکاندا وای لێ کردبێ ئەمەی کاك وریای لەبەر چاو بکەوێ . بەلام نامەی دوکتۆرای کاك وریا من بەباشی خوێندومەتەوە ئەو کاتەی لە لەندەن قوتابی بووم ئەوە نییە بڕیاری وای لەسەر بدرێ کە گوایە سەرپێی‌و ناتەواو بێ چونکە بەڕاستی پڕ بە پێستی زمانی کوردییەو لەسەر ئەساسی توێژەکانی لینگویستیکە . وەئەم نامەیە لە ساڵی ١٩٧٩ دا پێشکەش بە زانستگای لەندەن کراوە نەك لەساڵی ١٩٧٦ دا وەکو کاك ئیبراهیم ئەڵێ . سەرەڕای ئەمەش کاك ئیبراهیم ناتوانێ دەربارەی هەمو لایەنەکانی زمان بنوسێتەوە بۆئەوەی وەکو خۆی ئەڵێ ڕێزمانی کوردی دروستبکات وە ڕێزمان دروست ناکرێت بەڵکو ئەنووسرێتەوە .

وە هەرگیز ڕێگای نادرێتێ باسی فۆنەتیك بکات چونکە فۆنەتیکس لە سینتاکسەوە دوورەو فۆنەتیکیش بە بەشێکی لینگویستك دانانرێ بەڵکو بە بەشێکی سەربەخۆ لەقەڵەم ئەدرێ . سەرەڕای ئەمەش چونکە وەکو لەپێشەوە باسمان کرد جارێ دەستی نەداوەتە فۆنەتیك نووسینەوەو بە چەوتی یەکەم وشەی دەربارەی نووسیەوە .

کاك ئیبراهیم هەر بەمەوە نەوەستاوە کە کارەکەی کاك وریای بە سەرپێی داوەتە قەڵەم بەڵکو هەرچی هەیەو نییەو دەربارەی ڕێزمانی کوردی نووسراوەتەوە لەوپەری هیچەوە دەریکردووە . وە نابێ هیچ دەزگای بڵاوکردنەوەیەکی کوردی بڕیاری لەچاپدانی کارێکی وا بدات ئەمەش نەك لەبەر ئەوەیە کە نووسینەوەی زمانەوانەکانی بە پووچ داوەتە قەڵەم بەڵکو کتێبەکە زور دوورە لە زانستی زمانەوە چونکە تەنیا ڕیزکردنی شیعرو پەخشانەو هیچی کەو ئەبوایە وەکو کتێبێکی ئەدەبی دەربچووبایە . وە هۆی نووسینەوەی ئەم وتارە تەنیا پاراستنی زمانی کوردی لە هەڵەی زمانەوانی چونکە هەڵەی ئەدەبی بەشێوەیەکی ساکار ئەڕوات بەڵام هەڵەی زمانەوانی ئەبێتە هۆی گرتنی ڕیگایەکی چەوت هەتا هەتایە .

**ئینجا دەربارەی خۆی‌و کتێبەکەی خۆی ئەدوێ‌و ئەڵێ :**

**لەمە زیاتر لە کارەکەی خۆم نادوێم . . . . تا ئێستا لە دوو رۆژنامە لەسەر کارەکەم دواون وەکو رۆژنامەی (التآخی) . . . و رۆژنامەی (العیراق) .**

(زانایانیش وەکو ك – ك کوردییف ، چ خ بەکایف لەسەر کارەکەم بەباشی دواوون . . .) لەم دوو رۆژنامەدا کە لە بنەرەتدا یەك رۆژنامەن چونکە (العیراق) رۆژنامەی (التآخی) کۆنەو تەنیا ئەوەی نووسیووە کە کاك ئیبراهیم شەهادەی (کاندیدات)ی وەرگرتووەو ناونیشانی نامەی کاندیداتەکەی بڵاوکردۆتەوە . ئەی کامە هەڵسەنگاندنەکەیە ؟

لە لایەکی کەوە ئەم کتێبە دووبارەکردنەوەی کتێبی (هەندێ ئامرازی سینتاکس لە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا)ی پێشووە .

ئەگەر خوێنەری بەڕێز سەیرێکی ئەم دوو کتێبە بکات ئەوا زۆر بەشاسانی بۆی دەرئەکەوێ کە تا چی رادەیەك لەیەك قاڵبدا دارێژراونو لەسەر یەك مەوزوع ئەدوێن . ئەگەر بۆ نموونە سەیری لاپەرە (٧ – ٣١)ی ئەم کتێبە بکەین‌و

بەراووردی لەگەڵ لاپەرە (٧ – ٢٠)ی کتێبەکەی پێشوویدا بکەین ئەوا زۆر جوان ئەم ڕاستیەمان بۆ دەرئەکەوێ . وە تەنیا چەند لاپەرێکی زیادکردووە بە باسکردنی کارەکەی کاك وریاو شتی دووبارەی کە .

با بێینە سەر ئەوەی چۆن ئەم کتێبە باسی سینتاکس نییەو بەڵکو باسی کۆکردنەوەی شیعرو پەخشانە .

سینتاکس بەشێکی زانستی لینگویستکەو لە ریزکردنی ووشە ئەدوێ بۆ دروستکردنی رستەی تەواو ودەرخستنی پێوەندی کەرەسەکانی ناو رستە . بەگوێرەی یاسای سینتاکس بێ ئەوا ئەو کتێبە چەواشەیەو تەنیا بریتییە لە دێری شیعرو پەخشان بێ ئەوەی بزانێ کەرەسەکانی رستەکان کامیان لەیەکەوە نزیکن‌و کامیان پێوەندی پتەوی بەوی کەوە هەیەو بە گۆڕانیان چی لە واتا ئەگۆڕێ .

بۆ نموونە ئەگەر لە لاپەرە (٣٥)ی ئەو کتێبەوە پیا برۆین تا ئەگاتە کۆتای ئەو کتێبە ئەوا بە دەگمەن شیکردنەوەی زمانەوانیان بەرچاو ئەکەوێ وە ئەگەر بشبێ ئەوا مەبەستی تەواوو روون دەرناخەن . بۆ نموونە لە لاپەرە (٣٦)دا ئەڵێ :

**– موبتەدا ناوی هەیە :**

**– چیمەن ، کە سەوزەی نەوخیزی ناوە بەڵقەی فتبۆڵ پێ‌پەست کراوە .**

**ب موبتەدا راناوی جودایە :**

**بۆ نموونە :**

**– من ، کە لە شیعردا ناگەمە ئەوان هاوار ئەبەمە بارەگای یەزدان .**

بێ‌ئەوەی بڵێ کامەیە موبتەداو کامەن کەرەسەی بنەرەتی وەیا پێوەندی نێوانیان چیە . سەرەرای هەمو شت (مبتدأ)ی عەرەبی لە گرامەری عەرەبیەوە وەرگرتووەو تێکەڵاوی گرامەری ئەو زمانەکانی کەی کردووە . ئەمەش نەك تەنیا نموونەیەك بێت‌و بەس بەڵکو مەسەلەکەی تێکەڵاو کردووە بەشێوەیەکی واکە هەرگیز شی نەکرێتەوە . بەگوێرەی ئەم کتێبە بێت ئەوا گرامەری زمانی کوردی قوری بەسەرو لە هەرەس هێناندایە .

لەکۆتاییدا کاك ئیبراهیم ئەیەوێ رێزمانی کوردی دابنێ بەلام ئەو کتێبە پرە لە هەڵەی رێزمانی فەرموو با سەیری ئەم دوو سێ ریزە رستەیە بکەین :

**(منیش ، کە خاوەنی ئەم کارەم ، کە بابەتێکە لە بابەتەکانی سینتاکس . . . . ل ٢٢)**

**کوا فرمانەکە ؟ ئایا دارشتنێکی تەواوو مەبەست ئەبەخشێ ؟ چونکە نوقتەی داناوەو کۆتای بە رستەکە هێناوە .**

**وەیا : (لە لایەکی تر بایەخێك وەیان پەیوەندیکی راست‌و پتەو بۆ خۆی وەدەست‌دەنێ‌و دەکێشێ نەك تەنها لەرووی تیوری‌و بەس ، بەڵکو لەرووی کرداریشەوە)**

ئەبێ بووترێ .

(لە لایەکی ترەوە . . .) ئینجا بایەخ ئەدرێ نەك وەدەست ئەهێنرێ‌و یەکسەر بیخاتە سەر ووشەی پەیوەندییەك .

ئینجا بەگوێرەی ناوی کتێبەکە بێت ئەبێ باس زیاد لەیەك دیالیکت بکات چونکە ئەڵێت دیالیکتە ناوەندییەکان ئەبێ ناوەندی چەند دیالێکتی تێدا هەبێ‌و بۆ دەستنیشان نەکراون ؟

لەدواییدا سوپاسی کاك ئیبراهیم ئەکەم ونابێ دڵگیر بێت وەیا بە عاتیفەو بەکتر ناسین‌و شەهادە زمانەکەمان لێ نەرەنجێ‌و لەکیسمان بچێ‌و نرخی زانست‌و زانیاری بە ئاوا نەدەین .

● سەیری ئەم کتێبانە بکە :


A. R. Huddlestun (1979) (An Introduction to English Transformation Syntax)

B. Charles .F. Hockett – (1973) . Acourse in Modern Linguistecs.

C. H. Sommerstein (1977) . Modern Phonology.

D. P. Ladefoged (1975) . A Course in Phoretics.

E. N. Smith and D. Wilson (1979) Modern Linguistics.

F. Hyman . (1975) Phonologhy Theory and Analyspis.

G. Penguin Modern Linguistics Readings.

Syntactic Theory (1) Structuralist (1972)


١ – بروانە :
The Crgative Construction in Kurdish.
کە لەلایەن (Theoder Bynon) ەو نووسراوەتەوەو لە (Buuetin of thc School of oriental and African Studies, University of London , VOL , XLII , Part 2, 1979) دا بلاوکراوەتەوە .

٢ – ئەو نامەیە بۆ شەهادەنامەی دوکتۆری نووسرایەوەو پێشکەش‌کرا بەلام لەبەر چەند هۆیەك بۆ ئەم مەبەستە وەرنەگیراو کرا بە M.Phil بەلام لە لایەن دەزگای زانستگای لەندنەوە بەشێوەیەکی رەسمی راگەیەنرا کە شەهادەی لەوە بەرزتر زانستگابە کەسی نادات .

نووسین / عبدالکریم حسن مصطفى
کۆلێجی زانیاری بەغدا

پێشەکی :

گومان لەودانی‌یە لەگەل بەرە وپێش چوونی ڕەورەوی مێژوو پیشەسازی‌و تەکنۆلۆژیاش بەرەوپێش چووەو رۆژبە رۆژ داهێنان و دۆزینەوەی تیۆرو ئامێری نویٚ بەردەوام بووە ، مرۆڤ هەر لە کۆنەوە هەوڵی داوە ئەو سروشتە پانو بەرینەی بەردەستی بەکار بێنیٚ لە ژیانی رۆژانەیدا ، بگرە هەر لە دۆزینەوەی ئاگرو سوتاندنی دارو نەوتو بەکار هێنانی نوێلو خلوکەو گەڵی شتی ترەوە تا ئەودەمەی کە توانی سوود لە ووزەی شاراوەی ناو ناووکی ئەتۆم وەربگرێت ، بەلاٚم بەداخەوە لەسەرەتادا ئەو ووزە بەنرخە لە پێناوی خزمەت کردنی مرۆڤایەتی دا بەکار نەهێنرا بەلکو ئامانجە سەرەکی یەکەی لە

ناوبردنی ڕەگەزی مرۆڤ بوو ، بەڵام بەکار هێنانی ئەم ووزە زێڕینە لەسەر ئەم ڕێڕەوە بینی نەگرت بەڵکوو ئاراستەکەی گۆڕاو بەرەو خزمەت کردنی ڕاستەقینەی مرۆڤ کەوتەڕێ ئەویش لەوکاتەی زانایان گەیشتن بەوەی کە ووزەی کارەبایی لە ووزەی ئەتۆمی بەدەست بێنن لەدواییشدا لە کوورە ناووکییەکاندا ئەم ووزەیە وەك سامانێکی ئابووری بەکار هێنرا .

وائێمەش لێرەدا تیشکێك دەخەینە سەر ئەم باسەو چەند خاڵێك دەربارەی چۆنیەتی بە دەستهێنانی ئەم ووزەیە ڕوون دەکەینەوە .

### بەدەست هێنانی چاووگە—ووزە

● ئایا لەکاتی بۆردوومان کردنی یۆرانیۆم بە نیۆترۆن ؟ چ ڕوودەدات ؟

لەسییەکانی ئەم سەدەیە زانای سروشت ناسی ئیتالی (ئەنریکۆ فێرمی) لە زانکۆی ڕۆمادا لەگەڵ هاوڕێکانی ئیشی دەکردو لە لێکۆڵینەوەی کرداری بۆردوومان کردنی ماددە جیاوازەکان بەنیۆترۆن خەریك بوو . لەوکاتەدا چاووگێك لە ئاوێنەی ڕادیۆم – بریلیۆم وەك هاوبژەرێکی ئەتۆمی بەکار دەهێنرا ، لە ماوەیەکی کەمدا (فێرمی) بەهۆی چاووگێکی سادەو گونجاوی نیۆترۆنەکانەوە هەموو توخمەکانی (خشتەی خولی)[1] یەك لە دوای یەك بۆردوومان کرد . هەروەها لەم ماوەیەدا توانرا ژمارەیەکی زۆر لە ماددەی تیشکدەر دەستکردانە دروست بکرێت .

لە دواییدا نورەی یۆرانیۆم هاتو فێرمی پێشنیاری کرد کە لەوانەیە یۆرانیوم دوای مژینی نیۆترۆن بگۆڕێت بە چەند توخمێکی قورستری نوێ ، ئەو توخمانەش بە (توخمەکانی دوای یۆرانیۆم) ناونران کە لەڕاستیدا پاش بۆردوومان کردنی بە نیۆترۆن لە یۆرانیۆم پێك دێن . هەروەها لە ناو یۆرانیۆمدا چوار ناووکی تیشکدەری جیاواز لە شێوەوماوەکانی نیوەتەمەنی (العمر النصف) دۆزرایەوە .

لێرەدا ماوەنییە بۆ باسکردنی ئەو هەموو بایەخدانە زۆرەی کە زاناکانی جیهان بەگشتی بەم ئەنجامەیاندا ، ئەوە بوو زاناکان لێکۆڵینەوەو تاقیکردنەوەی جیاوازیان لەسەر توخمەکانی دوای یۆرانیۆم ئەنجام داو تاقیکردنەوەکانی فێرمییان بەڕێگەی جیاواز دووبارە کردەوەو بەشێوەیەکی گشتی بەهەمان ئەنجام گەیشتن ، بەڵام چەند ڕووداوێکی ئاڵۆز سەریان هەڵداکە زاناکانیان سەرسام کرد . ئەم ڕووداوانەش ئەمانە بوون : یەکەمیان ئەو ئاسانییە بوو کە ژمارەی توخمە تیشکدەرە نوێکان پێی زیادی دەکرد ، واتە توخمەکانی دوای یۆرانیۆم .

دووەمیان : دەرفەت نەبوو ئەو توخمانە (هەر چەندە یەکێکیش بێت) لە بارستەیەکی یۆرانیۆم ، سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵەی بۆی درا بەدەست – بهێنرێت .

ئەم جۆرە هەوڵدانە بە بێسوود پێنج ساڵی خایاند تا لە ساڵی ١٩٣٩ ی زاییندا ڕووداوێك کە بەهیچ جۆرێك بیری لێنەدەکرایەوە ڕوویدا ، ئەویش ئەوە بوو یەکێك لەو توخمە نوێیانەی کە دووزانای کیمیکی ئەڵمانی (أ–جانوم)و(ف – شتراسمان) لە ناو یۆرانیۆم پاش بۆردوومان کردنی بە نیۆترۆن دۆزیبوویانەوە ، ژمارە ئەتۆمییەکەی بەگوێرەی هەموو پێوانەو چاوەڕوان کردنێك دەبوایە یەکسان بێت بە ٩٣ ، ٩٤ ، ٩٥ هەتا ٩٧ بەڵام بە پێچەوانەوە توخمی باریۆم ، کە ژمارە ئەتۆمییەکەی (٥٦)ەو بەتەواوەتی دەکەوێتە ناوەڕاستی خشتەی خولی ، دەرکەوت . دامانو گرژبوونی ئەم دوو زانایە بریتی بوو لەوەی کە بە هیچ جۆرێك نیۆترۆن بۆی نییە کاتێ بە ناووکێك بکەوێت ژمارە ئەتۆمییەکەی (٩٢) بێت و بیگۆڕێت بۆ ناووکی توخمی باریۆم کە نزمترە لە توخمی یۆرانیۆم بەدوو جار .

زاناکان چەند جارێك ئەم تاقیکردنەوەیان دووبارە کردەوەو بە هەمان ئەنجام گەیشتن .

لێرەدا زاناکان تووشی دژایەتیی هەموو تاقیکردنەوەکانی فیزیکی ئەتۆمی پێشوو بوون ، تا لە پاییزی (١٩٣٩)دا دووزانای سروشتی ئەڵمانی (ل . مینر)و کوڕی خوشکی (أ–فریش) ، کە لەترسی نازییەکان لە ئەڵمانیاوە بۆ دانیمارك ڕایان کردبوو و لە کۆپنهاگن دەژیان ، توانیان هەرچی بەسەر یۆرانیۆم دادێت لەکاتی بۆردوومانکردنی بە نیۆترۆن لێك بدەنەوە . هەروەها لە ڕێگەی تاقیکردنەوەی زۆر هەستیار سەلماندیان کە ئەو کارلێکردنە دەبێتە هۆی پەیدا بوونی دوو تەنۆلکەی[2] نزیکە یەکسان لە بارستەو جیاواز لە ئاراستەی جووڵە . لەهەمان کاتدا شوێنەواری ئەو دوو تەنۆلکەدەرپەڕیوە بە ئاشکرا لەو وێنانەی کەلەدواییدا بەهۆی ژووری (ویلسن)ەوە گیران ، دەردەکەوێت .

لەو کاتەدا هیچ گومان لەوەدا نەبوو کە ناووکی یۆرانیۆم بە کارتێکردنی نیۆترۆن دەبێت بە دووبەشەوە ، لەمەشدا ووزەیەکی زۆر گەورە پەیدا دەبێت .

● نیۆترۆن ناووکی یۆرانیۆم لەت دەکات :

(میتنەر) و (فریش) باسی ئەم رووداوەیان کردو لەوکاتەدا لە تواناندا هەبوو لەسەر بنچینەی ئەو رووداوە وا دابنرێت کە : ئەوتەنۆلکانەی ناووکی توخمە جیاوازەکانی لێ پێك دێت وەك مۆلیکیولەکانی ناو دڵۆپەکانی شلەیەك رەفتار دەکەنو هەرچەندە دڵۆپەکەش گەورەتر بێت نا جێگیرتر[٣] دەبێت .

هەر کاتێکیش تەنۆلکەیەك بەناووکی ئەتۆمێکی نزیکە جێگیر بکەوێت ئەوا ناووکەکە ووزەیەکی زیادەکی (اضافي) وەردەگرێتو دەست بە جوولەیەکی لەپڕ دەکات و دەچێتە بارێکی دانە مرکاووەوە[٣] هەروەها وورو خاش دەبێت لەبارە دیاریکراوەکاندا . جالێرەدا دەتوانین وا دابنێین کە ناووکی ئەتۆمی یۆرانیۆم هەر لە خۆیەوە ناجێگیرە و لەوکاتەی نیۆترۆن بەری دەکەوێت ، لەجیاتی ئەوەی تەنۆلکەیەك یان ژمارەیەك تەنۆلکە وون بکات ، یەکسەر بۆ دوو ناووکی نزیکە یەکسان لەبارستایی‌یەوە لەت دەبێت ، ئەم کردارەش ناونرا (کرداری لەت بوونی ناووك) . لە ئەنجامی ئەم جۆرە لەت‌بوونەدا دوو ناووکی نوێ بۆ دوو توخم دەردەکەون ، کە کێشی ئەتۆمی هەریەکەیان دەکەوێتە نێوان ١١٥ — ١٢٠ وەکو برۆمو ئەنتان یان کریبتۆنو باریۆم و گەلێکی تر .

هەروەها روونکراوەتەوە کە ئەم ناووکانە تیشکدەر دەبنو پاش تیشکدانی تەنۆلکەی بێتا لە چەند جارێکی یەك لەدوای یەکدا جێگردەبن . لە هەمان کاتدا هەروەك هەژمار (حسابات) پیشانی دەدات ئەو پرۆشکانەی (الشظايا) لە ئەنجامی لەت‌بوونی ناووکی‌یەوە دەردەپەڕن جوولە ووزەیەکی ئەوتۆ وەردەگرن کە بەسەد کەرەت بەرزترە لەو ووزەیەی بەرەلادەبێت لە وودوخاش کردنی ناووك بەتەنۆلکەی ئەلفا یان پرۆتۆن ، پاش دۆزینەوەی تازە بابەت لە زانیاری فیزیکی ناووکیدا واتە لەت بوونی ناووك) زاناکان لە هەموو شوێنێك تاقی‌کردنەوەکانی خۆیان لەسەر توخمەکانی تر وەستاندو روویان کردە ناووکی یۆرانیۆم کەتا ئەوکاتە هۆی جێگیر نەبوونی ئەزانراو بوو . لە هاوێژگە ئاسایی‌یەکاندا (المدافع العادية) هەر لە کۆنەوە زاناکانو ئەندازیارەکان و داهێنەرەکان هەموو توانای خۆیان بۆ بەدەست هێنانی گەورە ترین خێرایی دەرپەڕین دەخستەکار ، بۆ ئەوەی قورسترین مووشەکی (قذيفة) گونجاوی پێ بهاوێژرێ چونکە هەر چەندە مووشەك قورستر بێت ئەوا گەورەتر دەبێتو تەقینەوەکەی زیاتر رووخێنەرتر دەبێت .

هەروەها لە کرداری بۆردوومان کردنی ناووکی توخمەکاندا زاناکان توانای خۆیان ئاراستەی ئەوە کرد کە مووشەکەکانیان بەهێزتر بێتو زۆرترین خێرایی‌یان هەبێت . باری نموونەیش لێرەدا دەکەوێتە سەر توانای تەنۆلکەی ئەلفاو پرۆتۆنەکانو نیۆترۆنەکان لە وەرگرتنی خێرایی‌یەکی ئەوتۆ کە نزیك بێت لە خێرایی رووناکی . لارۆ (شاذ)کانی ئەم یاسا ناسراوە بوو بەهۆی ئەنجامی چاوەروان نەکراو ، بەلام بەخێرایی دۆزرایەوە کە نیۆترۆن لەوکاتەی ووزەکەشی گەورە نەبێت توانای لەت‌کردنی ناووکی یۆرانیۆمی دەبێت بەرێگەیەکی سەر سورهێنەر ، بەجۆرێك تەنها لەیەك کەوتنیان بەس بێت بۆ لەت بوونی یۆرانیۆم بۆ دوو بەش .

لە بەرچی ئەم رووداوە نوێ‌یە بوو بەهۆی بایەخپێدانێکی زۆر لە لایەن زاناکانەوە ؟

پێش هەموو شتێك چونکە ئەو ووزەیەی لەم کارتێکردنە ناووکی‌یە پەیدادەبێت ئاسایی‌نی‌یەو لە دوایدا هەژمارو پێوانە کرداری‌یەکانیش پیشانیاندا کەهەر لەت بوونێکی ناووکی لە یۆرانیۆمدا ووزەیەك پەیدا دەکات نزیکەی دەکاتە (٢٠٠ ملیۆن ئەلیکترۆن ڤۆلت) ، هەروەها یەکسەر دوای ئەمەش دۆزرایەوە کە کارلێکردنی ناووکی لەکاتی لەت بوونی ناووکی ئەتۆمی یۆرانیۆم چەند نیۆترۆنێکی نوێ دەردە پەرێت ئەوراستی‌یە گرنگە بیروڕای دەرفەتی بە دەستهێنانی کارلێکردنێکی بەزاناکان راگەیاند کە دەرپەڕینی نیۆترۆنەکانی تێدا بەردەوام دەبێتو ژمارەیان بە بەردەوامی زیاد دەکاتو لەت بوونی نوێو یەك لەدوای یەك لە ناووکەکانی تری نوێی یۆرانیۆم روو دەدات .

تا ئێستا وتارێکی درێژمان لەپێش ماوە دەربارەی ئەم رووداوانە باشتر وایە لە یەکەم جاردا بەووردی لەوە بکۆڵینەوە کەچی بەسەر یۆرانیۆم دادێتو چەندها وتای[٤] تێدا هەیەو

له کامه هاوتا له هاوتاکانی‌دا لەت بوونی ناووکی بەهۆی نیۆترۆنەکان روودەدات و ئەو مەرجه تایبەتیانه چین کەپێویسته هەبێت بۆ نیۆترۆنەکان لەو کاتەدا ؟

## ● کۆمەڵەی هاوتاکانی یۆرانیۆم

پێش دۆزینەوەی لەت بوونی ناووکی یۆرانیۆم بە چوار ساڵ (واته له ساڵی ١٩٣٥) رووداوێك له تاقیگەی زانکۆی شیکاگۆ رووی‌دا ، هەرچەندە کارێکی گرنگی هەبوو لەسەر زانیاری فیزیکی ناووکی ، بەڵام لەوکاتەدا بایەخی پێ نەدرا .

رووداوەکەش ئەمه بوو لەو کاتەی کیمیاگەرو پسپۆر (ئەرتور دیەبستەر) ، کە له رەگەزدا کەنەدی بوو ، لێکۆڵینەوەکانی خۆی لەسەر توخمه جیاوازەکان بەهۆی ئامرازێکی زۆر ئاڵۆز پێی دەوترێ (بارسته شەبەنگبین)(*) ئەنجام دەدا .

پێش ئەمەش زاناکان به بەکارهێنانی ئەم ئامرازه ئەوەیان سەلماند بوو کە ئەتۆمەکانی زۆربەی توخمه سروشتی‌یەکان هەمان رەوشتی کیمیایی‌یان دەبێت سەرەرای یەکسان نەبوونی کێشه ئەتۆمی‌یەکانیان ، ئەمەش بوونی هاوتاکان پیشان دەدات .

ئەم زانایه لەیەکێ له تاقی‌کردنەوەکانی لەسەر یۆرانیۆمی پاك له ناکاودا له تەنیشت ئەو هێڵەی کە به ئاسایی لەسەر فلیمی وێنه گرتن بەجێ‌ی دەهێڵێ ، هێڵێکی باریکی دۆزی‌یەوە کە تێبینی کردنی گرانه ، له دوایدا دەرکەوت کە پەیدابوونی ئەم هێڵە باریکه دەگەرێتەوە بۆ هاوتای دووەمی یۆرانیۆم (یۆرانیۆم – ٢٣٥) کە زۆر بە کەمی هەیە .

دوای ئەمەش هاوتایەکی تری یۆرانیۆم کە بە دەگمەن هەیە (یۆرانیۆم – ٢٣٤) دۆزرایەوە .

هەژماری وورد پیشانی‌داوە کە یۆرانیۆمی پاك له باری ئاسایدا (٩٩٫٢٨٪ یۆرانیۆم – ٢٣٨ ، ٠٫٧١٤٪ یۆرانیۆم – ٢٣٥ ، تەنها ٠٫٠٠٦٪ یۆرانیوم – ٢٣٤)ی تێدایه .

پاش تێپەر بوونی پێنج ساڵ بەسەر ئەم دۆزینەوەیەدا ، کە ئەوکاته بەرووداوێکی زۆر بایەخدار نەدەژمێررا ، زاناکان توانیان ئەوە بسەلمێنن کە تەنها بەکارتێکردنی نیۆترۆنی هێواش لەت بوونی بەهێز له ناووکی یۆرانیۆم – ٢٣٥ روودەدات ، کە ئەمەش هاوتایەکی کەمی یۆرانیۆمەو تەنها ٠٫٠٠٧٪ی یۆرانیۆمی سروشتی پێك دەهێنێت . بەڵام هاوتای بنچینەیی کە (یۆرانیۆم – ٢٣٨)ە دوو ئەمەندە لەت دەبێت بەڵام بەکار تێکردنی خێراترین نیۆترۆن واته ووزەیەکی گەورەی هەبێت .

دوای ئەمە توانرا برێکی زۆر کەم له یۆرانیۆم – ٢٣٥ پوخته بکرێت‌و بۆردوومانیان کرد به نیۆترۆن هەمان ئەنجامی پێشور سەلمێندرا .

ئەمەش بەو پێشبینی‌یه دەژمێردرێت کە زانای بە ناوبانگ (نیلز بۆر) بەهاوبەشی لەگەڵ زانا (جۆن ویلەر) له زانکۆی (برینستۆن) راستەوخۆ دوای دۆزینەوەی هاوتاکانی یۆرانیۆم ، بەبیردۆز پیشانیان دابوو . پێشبینی‌یەکەش بریتی بوو له دەرفەتی لەت بوونی ناووکەکانی هاوتای یۆرانیۆم – ٢٣٥ تەنها بەکار تێکردنی نیۆترۆنە هێواشەکان ، ئەم راستی‌یەش بەلگەو شوێنەواری گرنگی له زانیاری فیزیکی نوێدا هەیە .

پاش ئەمە یەکێك له رۆژنامەکان له (٣٠)ی نیسانی ١٩٣٥ دا هەواڵێکی بەسوودی بڵاوکردەوە کە پیشانی‌دا :
(دکتۆر نیلزبۆر له کۆبنهاگن رایگەیاندووه کە بۆردوومان کردنی برێکی بچووك له یۆرانیۆم – ٢٣٥ به نیۆترۆنی هێواش کارلێکردنێکی زنجیرەیی روودەدات‌و تەقینەوەیەکی ئەتۆمی ووزەداری زۆرگەورەی لەگەڵ‌دا دەبێت بەجۆرێکی ئەوتۆ کە ئەو تاقیگەو ئامرازانەی دەکەونه ئەو ناوچەیەی نیوه تیرەکەی چەندەها میله له ئەنجامیدا دەفرێته ئاسمان .

## ● گەیشتن به ئامانجی چاوەروان کراو

له وزنجیره دۆزینەوانەی پەیوەندی‌یان به لەت بوونی ناووکی یۆرانیۆم هەبوو ، دەرکەوت کە گەورەترین و گرنگترین شت لەم رووداوەدا دەرپەرینی سێ نیۆترۆنی سەر بەخۆیەو پەیوەندی یان به دوو ناووکەکەی دوای لەت بوون نی‌یه .

بەهۆی ئەوراستی‌یەی دەڵێت نیۆترۆنەکان توانای لەت کردنی ناووکی ئەتۆمەکانی یۆرانیۆمیان هەیه ، توانرا لەو کاتەدا به بیردۆز وا دابنرێت کە هەریەکە لەو سێ نیۆترۆنانەی له ناووکی یۆرانیۆمی لەت بوودا دەردەپەرن ، تووشی ئەتۆمەکانی یۆرانیۆمی دەوروبەر دەبن و ناووکەکانیان لەت دەکەن ئەگەر بارو شوێن گونجاو بوو . لەهەمان کاتیشدا سێ نیۆترۆنی نوێ‌ی لێ دەردەپەرن‌و

ئەوانیش‌لای خۆیان تووشی ناووکی ‌ویّ دەبن لە یۆرانیۆم وەبەم جۆرە جا ‌ەبەر ئەوە کارلێکردنێکی ناووکی ‌زنجیرەیی لەت بوون چاوەڕوان دەکرێت‌و لەت بوونەکەش ‌مخێرایی‌یەکی گەورە زیاد بکات (۳ ، ۹ ، ۷ ، ۸۱ . . . هتد) .

یۆرانیۆم – ۲۳۵ وەك (نیلزبۆر) دەست نیشانی کردبوو تاقە توخمێکە ئەم جۆرە لەت بوونانەی تێدا ڕوودەدات ، نیۆترۆنە دەرپەڕیوەکانی ئەم لەت‌بوونانە لەکاتی بەریەك کەوتنیان لەگەل ناووکی ئەتۆمەکانی دەوروبەردا دەست بەجێ هێواش دەبنەوە ، بەمەش وای لیّ‌دێت توانای لەت کردنی ناووکەکانی هاوتای بنچینەیی ( یۆرانیۆم –۲۳۸) نەمێنێت .

جا ئەگەر بڕێکی تەواو لە یۆرانیۆم – ۲۳۵ لە دەوری ئەو خالەی کە ئەم لەت بوونە یەك لە دوای‌یەکانەی تێدا دەست پیّ‌دەکات ، هەبێت . ئەوا نزیکەی لەهەمان‌کاتدا تەقینەوەیەکی بەهێزی نائاسایی ڕوودەدات‌و ووزەیەکی زۆرگەورەی لیّ پەیدا دەبێت بەجۆریّ‌کە زیاترە لەو ووزەیەی کە لە تەقینەوەی بڕیکی هاوشێوەی بەهێزترین تەقەمەنی‌یە ناسراوەکان پەیدادەبێت ، بەملیۆنە هاجار .

زاناکان بەم ئەنجامە گەش بوونەوەو لەناکاودا بلاْوکردنەوەی هەموو وتارێك‌و دەنگ‌و باسێکی زانیاری لەبارەی ئەم بابەتانە لەهەموو شوێنێکی جیهان‌دا وەستێنرا ، تا لە دوایدا زاناکان ڕێگایەکیان دۆزی‌یەوە ئومێدەوار بوون ڕاستەوخۆ بیانگەیە نێتە ئامانجی چاوەڕوان کراو .

ماوەیەکی درێژ بیّ دەنگی بالّی کێشا بەسەر ئەم بابەتەو بەردەوام بوو تا سەرەتای شەری جیهانی دووەم ، تا لە رۆژی ١٦ی گەلاوێژی ١٩٤٥ دا لە پێش چاوی زاناکان‌و ئەندازیارەکان‌و تەکنیکی‌یەکان و نوێنەرەکانی کۆمەلّە میللی‌و سەربازی‌یەکانەوە یەکەم بۆمبای ئەتۆمی لە بیابانی (ئەموگادرۆ) لەویلایەتی (نیۆمەکسیکۆ) لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا و لە کاتژمێری پێنج و نیوی بەیانی ، کە لەوکاتەدا ئاوو هەوا باو بۆران بوو ، تەقێندرا .

تەقینەوەکەش بریتی بوو لە کار لێکردنێکی زنجیرەیی کە یەکسەر لە بڕێکی کەمی یۆرانیۆم دەستی پیّ‌کردو ووزەیەکی زۆرگەورەی لیّ پەیدابوو کە هەر لە بنەڕەتەوە لەناو ناووکی ئەتۆم‌دا شاردرابۆوە . یەکێك لەو کەسانەی کە بەشداری ئامادە بوونەکەی کردبوو باسی تەقینەوە کە دەکات‌و دەلێت : « لە سەرەتادا رۆشنایی‌یەك کە لەگەل دەورو بەرەکەی بەراورد نەدەکرا ، درەوشایەوە ، هەموو پەرش و بلاْوبووین‌و بەهۆی چاویلکەی رەشەوە سەیری کارلێکردنەکەمان کردو گۆیەکی بریسکەدارمان دیت ، لەپاش (٤٠) چرکەدا زنجیرەیلك تەقینەوە دەستی پیّ‌کردو گرمە گرمی گەورەی لەگەل دابوو بەلاْم ئەمەیان لای ئێمە سەیر نەبوو وەك ئەو ڕووناکی‌یە توندە نا ئاسایی‌یەی لە یەکەم جاردا تووشی بووین‌و هەمووی هەژاندین ، ئینجا هەورێکی چڕو گەورە پێکهات‌و سووڕی دەخواردو بەهێزێکی گەورە بەرەو سەرەوە دەچوو ، نزیکەی پاش پێنج خولەك گەیشتە چینە بەرزەکانی ئاسمان (ئەتمۆسفیر) . هەروەها لە سەرەتادا هەورەکە لەسەر شێوەی گۆ بەرزبۆوەو دوایی شێوەیەکی وەرگرت لە (کارگ) دەچوو ، لە پاشان بوو بە ستوونێکی درێژ ، لە کۆتایی‌دا دابەش بوو ، ئینجا تۆزو بایەکی گەورە بە ئاراستەو بەرزایی جیاواز هەلّی کرد» .

زۆربەی ئەوزانایانەی بە چاوی خۆیان تەقینەوەکەیان دیبوو بڕوایان وابوو بە دەرچوونی ووزەی ئەتۆمی‌و دەست بەسەر داگرتنی چاخێکی زێڕین دروست دەبێت بەلاْم بەمە رجێك شەڕو شۆر شوێنە واری نەمێنیّ ، هەروەها لە هەمان کاتیشدا هەرزانی دەست پیّ‌دەکات‌و وزەیەکی زۆرکەم یارمەتی بە دیهێنانی زۆر لە هیوا فراوانەکان دەدات .

رژێمی سەربازی ئەمەریکایی ئارەزوو مەند بوو ووزەی ئەتۆمی بە ئامانجی ترساندنی میللەتەکان‌و فەرمان ڕەواکان بەکاربهێنیّ ، بەم مەبەستەوە پێش کۆتایی هاتنی شەڕی جیهانی دووەم بە چەند ڕۆژێك کارێکی زۆر دڕندانەی قەوماند ، لەوکاتەی قسە دەربارەی خۆ بەدەستەوە دانی یابان هەبوو ، بۆمبای ئەتۆمی فڕیّ‌دایە سەر هەردوو شاری (هیرۆشیماو ناگازاکی) لەیابان‌و بە جارێك وێرانی کردن‌و بوو بەهۆی کوشتنی زیاتر لە سەدو سی (۱۳۰) هەزار کەس . بەلاْم دوای ئەمە رۆژی (۲۷)ی حوزەیرانی ١٩٥٤ هات‌و خەلك بەبیستن هەوالّی دروست کردنی ئێستگەی کارۆ ئەتۆمی بۆ یەکەم جار لە جیهاندا لە یەکێتی سۆڤیەتی ، گەشایەوە .

ئێستگەکەش بە ووزەی پەیدا بوو

له دابەش بوونی ناووکەکانی یۆرانیۆم ئیشی دەکرد . دەتوانین بڵێین ئەمە یەکەم بەکار هێنانی ڕاستەقینەی ووزەی ئەتۆمی بوو لە پێناوی خزمەتی مرۆڤایەتیدا .

● کارلێکردنە زنجیرەییە ڕێکەکان :

باوا دانێین نیۆترۆنێك لە بارستەیەکی (هاوتای یۆرانیۆم – ٢٣٥)ی پاك و گونجاو بۆ دابەش بوون دەرکەوت . جا ئەگەر هاتوو نیۆترۆنەکە چووە ناو یەکێ لە ناووکەکانی یۆرانیۆمی دەوروپشت ، ئەوا دوویان سێ نیۆترۆنی تر دەردەکەونو ئەوانیش دوویان سێ ناووکی تر لەت دەکەن هەروەها بەم جۆرە .

جا لەبەر ئەوەی هەر یەکە لەو لەت بوونانە بە خێراییەکی زۆرگەورە ولە ماوەی بەشێك لە سەدەها ملیۆن بەشی چرکەیەك ڕوودەدات ، بڕی نیۆترۆنە دەرپەڕیوەکان بەشێوەیەکی لەپڕ هەتا دەگاتە بڕێکی زۆرگەورە زیاد دەکات .

هەروەها دەتوانین بڵێین کارلێکردنێکی زنجیرەییو خۆیی و نارێك دەست پێ‌دەکات . جا بۆ ئەوەی بە بەردەوامی خێرایی زیاد بوونی ئەو کارلێکردنە لە بەشێك لە ماددەی بەشبوو دیاری بکەین ، بڕەیەکی تایبەتی بەکار دەهێنین پێ‌ی دەوترێت (هاوکۆلکەی زۆربوون)[٦] ئەم هاوکۆلکەیە ئەم بڕەبەش پیشان دەدات کە نەوەی نیۆترۆنەکانی داهاتوو لەوەی پێشوو پێ زیاد دەکات ، یان بە واتایەکی تر ژمارەی کەرەتەکان پیشان دەدات کە هەلقوولانی نیۆترۆنەکان پێ‌ی زیاد دەکات پاش هەر بەکار هێنانێك بۆ بڕێکی دیاریکراو لێ‌ی .

جا ئەگەر هاتوو ئەو هاوکۆلکەیە لە (یەك) گەورەتر بوو ئەوا بڕی نیۆترۆنەکانو ناووکە بەش بووەکانی یورانیۆم – ٢٣٥ یان بلۆتۆنیۆم بەبێ سنوور زیاد دەکات و بە ناچاری کردارەکە بەتەقینەوە کۆتایی دێت . ئەمەش هەمان ئەو کارلێکردنەیە کە لە بۆمبای ئەتۆمی ڕوودەدات .

بۆ ئەوەی بتوانرێت کارلێکردنی ناووکی بۆ ئامانجی ئاشتی بەکار بهێنرێت پێویستە ئەو کار لێکردنە ڕێك بێت (واتە ڕێکخەری هەبێت) ، هەروەها پێویستە بگەین بەوەی کە ژمارەی دابەش بوونەکان لەیەکەی کاتدا لە بڕێکی نەگۆڕی دیاریکراودا زیاتر نەبێت ، لە هەمان کاتیشدا دەبێت ووزەی پەیدا بوو بچووك بێت . ئەو مەرجانەش ئەو کاتە دێتەکایەوە ئەگەر هاوکۆلکەی زۆر بوون بەتەواوەتی یەکسان بێت بە (یەك) . بەڵام ئەگەر نرخی هاوکۆلکەکە لە (یەك) کەمتر بێت هەرچەندە بە بڕێکی زۆر کەمیش بێت ، ئەوا کارلێکردنەکە دادەمرکێتەوە .

ئێستاش ئەم پرسیارە سەر هەڵدەدات و دەڵێت چۆن کارلێکردنی زنجیرەیی ڕێك بە دەست دەهێنرێت ؟

کارلێکردنی سروشتی لە یۆرانیۆمی سروشتی ڕوونادات چونکە هاوکۆلکەی زۆربوون تیایدا لە (یەك) کەمترە .

هەروەها ئەو نیۆترۆنانەی لە ئەنجامی دابەش بوونی سروشتی یان دەستکرد لە (یۆرانیۆم – ٢٣٥)دا دەردەکەون لەهەمانکاتدا یۆرانیۆم –٢٣٨ خێراییان کەم دەکاتەوەو دەیانەژێتو نیۆ ترۆنی تازەش بۆ بەردەوام بوونی کارلێکردنەکە بەرەللاناکات ، ئەمەش لەکاتێکدا ڕوودەدات پێش ئەوەی نیۆترۆنەکانی سەرەتا بتوانن بە ناووکەکانی یۆرانیۆم–٢٣٥ بکەون .

گەلێك ڕێگا بۆ دەستهێنانی کارلێکردنی زنجیرەیی لە یۆرانیۆمی سروشتیدا هەبوو ، بەڵام لە هەموویاندا گیروگرفت ئەمە بوو کە دەبێ خێرایی نیۆترۆنەکان یەکسەر پاش هەر دابەش بوونێك لە یۆرانیۆم – ٢٣٥ کەم بکرێتەوە تا دەگاتە ئەو خێراییەی یۆرانیۆم–٢٣٨ نەتوانێت ڕاویان بکات یان بەشێوەیەکی تر پێویستە بەو پەڕی خێراییەوە لە خێراییە لەرە لەر دارەکانەوە دوورکەوینەوە لە ئەنجامدا هیچ شتێك لە پێش نیۆترۆنەکان نامێنێت تەنها دابەشکردنی ژمارەیەکی کەم نەبێت لە ناووکەکانی یۆرانیۆم–٢٣٥– لەم بارەشدا دەبێ بڕێکی زۆر گەورەمان لە یۆرانیۆمی سروشتی هەبێت ئەوسا ڕوودانی کارلێکردنی زنجیرەیی گونجاو دەبێت .

لێرە گەورەترین گیروگرفت لای زاناکان پەیدا کردنی ئەو ماددەیە بوو کە لە کورتترین کاتی گونجاودا خێرایی نیۆترۆنە دەرپەڕیوە تیژڕەوەکان کەم دەکاتەوە تا دەگاتە خێراییە گەرمییەکان کە ئەویش نزیکە لە ٣ر٠ – ١ر٠ ئەلیکترۆن ڤۆلت ، لەهەمان کاتیشدا ئەو ماددەیە خۆی هیچ نیۆترۆنێك هەڵنەمژێت .

بەم جۆرە دەبینین بۆ گەیشتن بە یەکەم قۆناخی سەرکەوتن پێویستە هێوا شکەووەیەك بۆ نیۆترۆنەکان بخرێتە ناو یۆرانیۆمی سروشتی .

## ● بۆمبای ئەتۆمی :

بێگومان دابەش بوونی ناووکێکی یۆرانیۆم ٢٣٥ لە ماوەیەکی زۆر زۆر کورتداکە نزیکەی یەکسانە بەیەك ئەسەد ملیۆن بەشی چرکەیەك ، ڕوودەدات . جا ئەگەر لەهەر دابەشبوونێکدا دوویان سێ نیۆترۆن دەرپەڕێت ئەوانیش لەهەمان‌کاتدا ناووکی نوێ تێکدەشکێنن و پاش (١٠٠) زنجیرە لەم دابەش بنننانە ، واتە پاش تێپەڕبوونی‌یەك ملیۆن بەشی چرکەیەك ، ژمارەی ئەم ئەتۆمانەی دابەش دەبن دەگاتە $٣\times١٠^{٢٤}$ ئەتۆم ، وە ئەم ژمارەیەش لە کیلۆگرامێك لە (یۆرانیۆم -٢٣٥)دا هەیە ، بەمەش تەقینەوەیەك بەهێزێکی زۆر گەورەی ڕووخێنەر ڕوودەدات هەروەها لەکاتی ئەم دابەش بوونانەدا ووزە پەیدا بووەکە نزیکەی یەکسانە بە ووزەی پەیدا بوو لە تەقینەوەی (٢٥٠٠ - ٣٠٠٠) تۆن لە بە هێزترین مادە تەقەمەنی‌یە کیمیکی‌یەکاندا بەلام ئەم جۆرە تەقینەوەیەش ئەتها لە ژێر باری دیاریکراودا ڕوودەدات .

ئەگەر کار لێکردنێکی زنجیرەیی لە بڕێکی کەم لە (یۆرانیۆم -٢٣٤)دا . دروست بوو ئەوا هەموو نیۆترۆنە دەرپەڕیوەکان ناووکەکانی تر دابەش. ناکەن و زۆربەیان پێش ئەوەی هەستن بە داتلیشانی ناووکەکانی یۆرانیۆم ، دەردەچنە دەرەوەی داڕێژراوەکە (واتە داڕێژراوی یۆرانیۆمەکە) . وە شتێکی ئاشکرایە کە هاوکۆلکەی زۆربوون لەم کۆمەڵەیەدا لە (یەك) کەمتر دەبێت ، جا لەبەر ئەوە کارلێکردنی زنجیرەیی لە داڕێژراوەکە تەمەن کورت دەبێت بەڵکو لە (یۆرانیۆم - ٢٣٥)ی خاوێن ستەمە .

ئـــــەگەر داڕێژراوێکان بەدووری‌یەکی دیاریکراو ڕێکخستو بەمەرجێك ژمارەی ئەو نیۆترۆنانەی لێیەوە دەردەپەڕن لە ژمارەی ئەو نیۆترۆنانەی بەجێی دێڵن زیاتر بێت .

ئەوسا کار لێکردنە زنجیرەیی‌یەکە تیایدا شێوەیەکی تەقینەوە وەردەگرێت . وە کەمترین بڕ لە (یۆرانیۆم - ٢٣٥)ی بەشبوو کە کارلێکردنی زنجیرەیی تیایدا ڕوودەدات پێی دەوترێت (بڕی مۆڵەقە) .

مەسەلەی دیاریکردنی ئەم بڕەیەش (بڕی مۆڵەقە) گرانترین و ترسناکترین مەسەلە بوو ڕوو بەڕووی زاناکان بوو لە کاتی نەخشە کێشانی بۆمبای ئەتۆمی‌دا ، چونکە لەوانە بوو هەژماردنە کە زۆر وورد نەبێت ، بەمەش ئەنجامەکەی تر سێنەر دەبێت و لەوانەشە تەقینەوەی ئەتۆمی ڕووبدات . ئەمەش نەخشەکاری یەکێك لە بۆمبا ئەتۆمی‌یەکانە :

بڕێکی مۆڵەقە لە یۆرانیۆم (یان بڕێك کە تۆزێك لەبڕی مۆڵەقە گەورەتربێت) بۆ دوو نیوە گۆ دابەش دەکرێت ، بەمەرجێك هەریەکە لەم دوو نیوەیە لە بارستەی مۆڵەقە بچووکتر بێت . ئینجا هەر یەکە لەم دوو نیوە گۆیەبە ماوەیەکی زۆر لە یەکتر دوو دەکرێنەوە ، بەمەش سەرهەڵدانی کارلێکردنی زنجیرەیی ستەم دەبێت و بۆمباکەش ترسناك نابێت .

بەڵام ئەگەر یەکێك لەم دوو نیوە گۆیەمان بەخێرایی‌یەکی ئەوتۆ لەوی تر نزیك کردەوە ، وەك چۆن یەکێکیان بۆ ئەویتریان بهاوێژرێت ، ئەوسا لەکاتی یەکگرکگرتنیاندا بارستایی داڕێژراوەکە لەبڕی مۆڵەقە گەورەتر دەبێت و کارلێکردنی ناووکی زنجیرەیی دروست دەبێ و تەقینەوە ڕوودەدات . هەروەها دەتوانرێت بارستەی مۆڵەقە بۆ نیوەگۆ کەم بکرێتەوە ئەویش بە ەورگرتنی بە بەرگێکی ئەوتۆ کە نیۆترۆنەکان بەر پەرچ بداتەوەو بیانگەڕێنێتەوە بۆ ماددەی یۆرانیۆمەکە .

لێرەدا هەرچۆنێك بێت دەبێ نزیك کردنەوەی نیوەگۆیەکە لەوی‌تر بەخێرایی‌یەکی زۆرگەورە بێت ، چونکە کارلێکردنی زنجیرەیی لە هەموو بەشێکی گۆیەکەدا پاش ماوەیەکی زۆر کەم و پێش ئەوەی دوو نیوەگۆکە بەیەکەوە بلکێن دەست پێ‌دەکات . بەمەش هێزی تەقینەوە دەبێتە هۆی جیاکردنەوەی بەشەکانی گۆیەکە پێش ئەوەی کارلێکردن لە هەموو ئەتۆمەکانی یۆرانیۆمەکە ڕووبدات . هەروەها بوونی بەرگی قورس و چڕ لە دەرەوەی بۆمباکە ڕوودانی ئەمە قەدەغە دەکات . هەروەها بەگوێرەی ئەنجامە بلاوکراوەکاندا ئەو بارستە (یۆرانیۆم - ٢٣٥)ە یان بلۆتۆنیۆمەی لە بۆمبای ئەتۆمیدا هەیە دەگاتە چەند کیلۆگرامێك .

ئەم باسە لە کتێبی
(الطاقە الذریة)ی
ك . جلادکۆف وەرگیراوە

(١) خشتەی خولی : الجدول الدوري
(٢) تەنۆلکە : جسیم
(٣) دانەمرکاو : غیر مستقر
(٤) هاوتاکان : نظائر
(٥) بارستە شەبەنگیێن : المطیاف الکتلي
(٦) هاوکۆلکەی زۆربوون : معامل التکاثر
(٧) هێواشکەرەوە : المبطیء

# هەڵەی ناوکە

هەموو نەخۆشییەك ، لە ئەنجامی هەڵەیەکەوە پەیدادەبێت . دەگونجێت ئەو هەڵەیە : ئۆرگانیك یان فسیولوجی یان کیمیایی وەیان دەروونی بێت .

دەتوانرێ زۆربەی نەخۆشییەکان بەهۆی دەرمانو نەشتەرگەری‌یەوە چارەسەربکرێت ، بەڵام ئەمە لەگەڵ ئەو نەخۆشییانەی لە ئەنجامی «هەڵەی رەچەڵەکی خطأ وراثي»یەوە پەیدادەبێت ، ناگونجێت ، کە لە بنچینەدا بریتییە لە «هەڵەی بەرێوەبەرێتی گەردی لەناو ناوکی شانەدا .

هەر هەڵەیەك لە (هێمایەکی پەرلەیی رەچەڵەکی) ، واتە گەیشتن بە سنووری جویکەرەوەی نێوان ژیانو مردن .

وەك زانراوە ژمارەی ئەو « پەرلە هێمایانە»ی لە هەر شانەیەکی لەشی مرۆڤ‌دا هەیە دەگاتە «هەشت هەزار ملیۆن پەرلە» . ئەم پەرلانە لەسەر شریتی زور باریکی کیمیایی تۆمارکراون . هەر شریتێك دەگونجێ دەیانو سەدان ملیۆن پەرلەی لەسەر تۆمارکرابێت ، بەشێوەیەکی یەکجار رێکوپێك .

زۆربەی ئەوانەی لەدایك دەبن بەبێ «نەخۆشی رەچەڵەکی : أمراض وراثية» دێنە ژیانەوە . بەڵام رێژەیەکی زۆر کەم هەن ، کە هەڵەیەك وەیان چەند هەڵەیەك لە رێکخستنی پەرلەی خانەکانیان‌دا رووئەدات کە ئەمەش ئەبێتە هۆی دیاری‌دانی نەخۆشی رەچەڵەکی » بە نیشانەی تایبەتی‌یەوە .

ئێستەش لە یەکێك لەو نەخۆشییانە دەدوێین کە بە زۆری لە کیشوەری ئەفریقاوە بەتایبەتی وولاتانی «لیبیاو جەزایرو سوودان» و سعودیەو وولاتانی خلیج‌دا بلاوە .

ئەم نەخۆشییە تووشی «گەردە پرۆتینیە گەورەکان دەبێت . ئەم گەردانە بە «هیمۆگلۆبین »دەناسرێن ، کە رەنگی سوور بە خوێن دەبەخشن . کاتی خۆی ئەم نەخۆشییە لەناو رەش پێستەکانی ئەفریقادا بلاوبوو ، پاشان لە ئەنجامی «کۆچ‌کردن : الهجرة» و تێکەلی‌دا بۆ وولاتە دراوسێکان وە پاشان بەهۆی «بازرگانیی کۆیلە» بۆ ئەمەریکاش گوێزرایەوە . کەس هۆی ئەم نەخۆشییەی نەدەزانی ، تەنها ئەوە دەزانرا کە تووشی گەورەو بچووك ، نێرو مێ ، دەبێ‌و لە ماوەیەکی کەم‌دا پاش چەند رۆژێك «تالێهاتن» وە ئازارو ژانێکی زۆر لە ئێسك‌و زگ‌و جومگەکان‌دا ئەبێتە هۆی مردن .

لە ساڵی ١٩١٠ پاش لێکۆڵینەوەی ئەم حاڵەتە سەیرە ، دەرکەوت کە یەکێکە لە حاڵەتە نائاسایی‌یەکانی نەخۆشی «ئەنیمیا : فقر الدم» .

لەم بارەدا ئەگەر لەژێر میکرۆسکۆب‌دا سەیری خرۆکە سوورەکان بکرێت ، ئەوا لە شێوەی داس وەیان (مانگی یەك‌شەوە دا دەردەکەون ، خۆیان بە شێوەی ئاسایی خرو خەپلەیین : ئەوانەی تووشی ئەم نەخۆشییە دەبن ، ژمارەی خرۆکەکانی خوێنیان زۆر کەمترە لە مرۆڤێکی ساغ .

وەك دەزانین گەردەکانی هیمۆگلۆبین گازی ئۆکسجین هەڵدەگرن‌و بەو خانانەی دەگەیەنن کە پێویستیان پی‌ی هەیە . کاتێك چڕیی ئەم گازە لە هیمۆگلۆبین‌دا کەم‌دەبێتەوە ، شێوەی خرۆکەکان دەگۆڕرێت بۆ «شێوە داسی وەیان شێوەی تر» بەڵام

# رەچەڵەکی یەکان

ئازاد محمود احمد
وەریگێڕاوە

کاتێك خوێن بەم گازە تێردەبێت ئەوا خرۆکەکان دەگەڕێنەوە بارو شێوەی ئاسایی خۆیان واتە «خڕ یان خەپلەیی» .

له سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی بیستدا ، پاش پێش‌کەوتنی هۆیە زانیاریەکانو پەی‌بردن بە . . رەچەڵەکە پەرلەکانو زانینی پێکهاتنی ووردی هەندێك لە گەردە پرۆتینی‌یە ئاڵۆزەکان ، زانایان بۆیان دەرکەوت کە :

ئەم گەردە پرۆتینیانە لە کۆمەڵێك «ئەمینۆ ئەسید : ترشی ئەمینی»ی بەیەکداچوو ، وە بەپی‌ی پرۆگرامێکی دیاری‌کراو لەسەر (شریتە – رەچەڵەکی‌یەکان دروست دەبن .

پاشان زاناکان هاتن ، گەردێکی هیمۆگلۆبینیان کرد بە ٢٦ بەشەوە ، بەشێوەیەك کە هەر بەشێك (زنجیرەیەك لە ئەمینۆ ئەسیدی «بەیەك‌داچوو : ئاڵۆزاو»ی گرتە خۆی . پاش بەکارهێنانی چەند ڕێگەیەکی ووردی زانستی‌ی درێژ گەیشتنە زانینو خوێندنەوەی ناوەڕۆکی هەر زنجیرە ئەمینۆ ئەسیدێك . دوای بەراووردکردنی گەردە گەورەکانی هیمۆگلۆبینی ساغو هیمۆگلۆبینی دابڕاو لە خانە خوێنە نائاسایی‌یەکاندا ، بۆیان دەرکەوت کە لە هەر ٢٦ زنجیرەکە ٢٥ یان بەتەواوی وەك یەکنو جیاوازی‌یان نیە لە ناوەڕۆكو پێکهاتنیاندا ، بەڵام ئەو زنجیرەیەی کە لە «٢٥»ەکەی تر ناچێت ، زنجیرەیەکی کورتەو «هەڵە : ناتەواوی » یەکی پچووکی تیایە کە دەبێ بەهۆی پەك‌خستنی گەردە هیمۆگلۆبینیەکە ، لە کاتی کەم‌بوونەوەی چڕی‌ی گازی ئۆکسجین ، وە شێوەی داس وەیان کەوانەیی بە خڕۆکەکانی خوێن دەدا .

ئینجا بۆ ئەوەی هۆی تەواوی ئەم هەڵە رەچەڵەکی‌یە بزانین ، پێویستە لە چۆنێتی دروست‌بوونی ئەم « پێکهاتووە پرۆتینیە ووردانە» بکۆڵینەوە . . .

گەردێکی هیمۆگلۆبین بە تەنها لە (٢٨٧) ئەمینۆ ئەسید پێك‌دێت . لەمانە ١٤١ ئەمینۆ ئەسید (دوو زنجیرەی درێژی «ئەی :
پ
د» پێك دێنن کە کورت ترن لە دوو زنجیرەی درێژی «ئەی : (A
.ئەم ٤ زنجیرەیە پێکەوە پێکهاتوویەکی ئەندازەیی ڕێگ‌وپێگ دروست‌دەکەن کە ٤ کۆمەڵەی «ئاسن : فیرۆم» تیای‌دا بەشداری‌دەکات ، هەر کۆمەڵەیەك پی‌ی دەووترێ «هیم HEME) . ئەم کۆمەڵە هیمانە چەند مەڵبەندێکی ستراتیجی دیاری کراو داگیر دەکەن وە ڕەنگی سووری خوێنین بە پرۆتین دەبەخشن .

ئەم ڕێکخستنو پێکهاتنە مەزنە لە گەردی پرۆتیندا ، هەر لە خۆیەوە ڕوونادات . هەر گەردیلەیەك لەو (دە هەزار گەردیلەیەی بەشداری‌ی پێکهاتن دەکات) شوێنو فرمانی تایبەتی خۆی دەزانێت . وەك دەرکەوتوە گەردی پرۆتین هەمان ڕەوشتی «سی»ی هەیە . واتە هەروەك «سی» لە کاتی هەناسەدانو هەناسە دانەوەدا بەرزو نزم دەبێتەوە . بەشێوەیەك کە دوو زنجیرە لە چوار زنجیرەی گەردە پرۆتینیەکە بە بوونو

نەبوونی گازی ئۆکسجین لێک نزیکدەبنەوەو لێڵ دووردەکەونەوە .

دکتۆر م.ف. پیرونز ، کە سەرۆکی کارگەی بایۆلۆجیای گەردییەوە لە زانکۆی کامبریدج ، وە لە ساڵی ١٩٦٢ دا خەلآتی نۆبڵی لە (کیمیای ژیواری)دا وەرگرتوە ، پاش ئەوەی کە زنجیرەکانی ئەم گەردە پرۆتینیەی خوێندەوە ، باسی ئەوە دەکات کە «کاتێك خەریك بوو بە ئامادەکردنی نامەی دوکتۆراکەی لەبارەی ووردە پێکهاتنی گەردی هیمۆگلۆبین – ساڵی ١٩٣٧» ، مامۆستاکەی داوای ئەوەی لێ نەکرد کە « ئەو یاسا ئاڵۆزانە شیبکاتەوە کە ئەمینۆ ئەسیدەکانی پێ ڕیزبوون لە گەردی پرۆتیندا» چونکە بەڕای مامۆستاکەی ئەم کارە «٢٥» ساڵێکی دەخایاند ، بۆیە داوای کرد تەنها شێوەو وێنەیەکی ، گشتیی چۆنێتی ئەو گەردە ، بەڕێگای شیکاریی ئاڵۆز پێشکەش بکات .

زاناکان گەیشتنە دۆزینەوەی هۆی ڕاستەقینەی «گۆڕانی شێوەی خڕۆکی خوێن» لە شێوە خەپلەیی‌یەوە بۆ شێوە داسی ، کە دەبێتە هۆی مردن . وە زانرا کە جیاوازی نێوان گەردێکی تەواوو گەردێکی «هەڵە : ناتەواو» لە تەنها ئەمینۆ–ئەسیدێکدایە لەو ٢٨٧ ئەمینۆ ئەسیدەی کە گەردێکی هیمۆگلۆبینی لێ پێکدێت .

لێپرسراوی ئەم هەڵەیەش «ناووکی شانە»یە وەیان چاکتر بڵێین هەڵەکە لە «یەکێك لەو شریتە زۆر باریکانەدایە رەچەڵەکە پەڕلەکەی لەسەرە ، لەناو ناووکی شانەدا . . .»

وەك ووتمان هەشت هەزار ملیون (پەڕلە : شفرة) هەیە لە هەر خانەیەکدا ، واتە تەنها هەڵەیەك لە پەڕلەیەکدا لەو هەشت هەزار ملێونە ، دەبێ بەهۆی پێکهاتنی گەردێکی پرۆتینیی ناتەواو ! ! ! .

لە ژیانماندا لە چوار ئاوێتەی کیمیایی زیاتر نییە ئەوانەش بریتین لە :

ئەدینین ، ثایامین ، گوانین ، سایتۆزین ، بۆ ئاسانی دەنووسین (أ ، ث ،گ ،س) ئەم ئاوێتانە بەشێوەیەکی ڕێك‌وپێك لەسەر (شریتە رەچەڵەکی‌یەکان) . جووت‌جووت ڕیزبوون . واتە (أ ،ث) جووتێك وە (گ ،س) جووتێکی تر پێکدێنێ ، بە دووبارەبوونەوەو جی‌گۆڕکێی ئەم جووتانە لە شریتە رەچەڵکی‌یەکاندا وە بەپێی یاساو ڕژێمێکی تایبەتی بلیۆنەها (پەڕلە : شفرة)ی (مانادار : التي لها معنی) بەرهەم‌دێت .



بۆ درووستبوونی پرۆتینێکی وەك هیمۆگلۆبین ، (پەرلەی سێیانە پێك‌دێت (أ أ ث) کە مانای جیاوازە لە مانای (أ أ گ)وە (أ ث گ) کە ماناکەی جیاوازە لە (أ گ ث) . . . وە هەروەها . . .

هەر شیفرەیەکی سیانی پەیوەندی دەکات بە یەکێ لەو (بیست ئەمینۆ ئەسیدە)ی کە لە ژیاندا بەکاردێ بۆ پێکهێنانی پرۆتین .

بۆ نموونە گەردی هیمۆگلۆبین پێك‌هاتووە لە ۲۸۷ ئاسید . کەواتە پێویستە لەسەر ناووك لەشێوەی شریتێك‌دا فەرمان بنێرێ کە « ۸٦۱ » هێمای لەسەر بێت .

ئەم ژمارەیەش «۸٦۱» لەوەوە هاتووە کە :

۲۸۷ ئەسید هەیە وە پەرلەکانیش (سیانی : ثلاثی)

ن ،کەواتە : ۳×۲۸۷= ۸٦۱ هێما .

لە کۆتاییدا زاناکان توانیان هە... ۆزنەوەو بۆیان دەرکەوت کە (پەرلە سیانی یەکەی سەر شریتە رەچەڵەکی یەکە لەبری (س ث ث) کە شێوەیەکی ئاسایی یە ، گۆڕاوە بۆ (س أ ث) ، واتە لەبری ئەدینین (أ) ، ثایامین (ث) بەشداری پێکهاتنی پەرلە سیانیەکەی کردووە .

کاتێکیش کە « پەرلەکان» دەنێررێن بۆ ئەوەی لەسەر رایبۆسۆمەکان جێ‌گیر بن یان چاپ بن ، بە تەواوی کاریگەری هەڵەکە دیاری‌دەدات ، چونکە پاش گۆڕانی (س ث ث) بۆ (س أ ث) پەرلەی (س أ ث) ئەمینۆ ئەسیدی «ڤالین » کۆدەکاتەوە لەبری ئەمینۆ ئەسیدی «جلوتامیك» کە تایبەتە بە (س ث ث) . ئەمەش لە ئەنجاما دەبێتە هۆی دروست‌بوونی گەردێکی هیمۆگلۆبینی «ناتەواو : هەڵە» .

واتە لەو ۲۸۷ ئەمینۆ ئەسیدەی کە پێکی دێنێ ، یەکێکیان هەڵەیە یان ناتەواو ، لە ئەنجامی تەنها هەڵەیەکەوە لەو ۸٦۱ هێمایەی لەسەر شریتە کیمیایی یەکە تۆمارکراوە .

– بەڵام چۆن تەنها هەڵەیەکی وا بچووك دەبێتە هۆی ڕوودانی ئەو کارەساتە ؟

وەڵامەکەش ئەوەیە :

ئەگەر ئەسیدێك لەبری ئەسیدێکی تر بەکارهات ، بێ‌گومان دەبێتە هۆی ڕوودانی (کارلێك‌کردنی) تایبەتی‌ی جیاواز لە کارلێکی گەردەکانی تری هیمۆگلۆبینی ناو خڕۆکە سوورەکان (کە گۆڕان تیایاندا ڕووی نەداوە) وە بەتایبەتی لە کاتی کەم‌بوونەوەی چڕیی گازی ئۆکسیجین‌دا ، بەمەش چەند پێکهاتوویەك دروست‌دەبێت کە لە دەزووی زۆر باریکی «لوول‌پێچی» دەچێت ، بە دەرکەوتنی ئەم دەزوانە لە خڕۆکە سوورەکانیدا ، دەبنە هۆی گیرخواردنی خڕۆکەکان لەناو (موولوولە خوێنە تەسکەکان)دا بەمەش خڕۆکەکان تێك‌دەشکێن‌و پاشان نیشانەکانی نەخۆشی «ئەنیمیا : فقر الدم» دیاری‌دەدات .

ئەوەبوو لە باسی هۆی نەخۆشییە رەچەڵەکی‌یەکە . بەڵام بۆ «چارەسەری» : بێ‌گومان ئەوە کارێکی زۆر ستەم‌و دژوارە وە لە توانادا نییە (تاکو ئێستا) کە شوێنی هەڵەکە وەیان تەنانەت شوێنی ئەو جینەش دیاری‌بکەین کە هەڵەکەی تیا ڕوودواە ، چونکە ئەو هەڵەیە لە (یەکێك لەو سەد هەزار جینە)دا یەکە :

(رەچەڵەکە کۆئەندام : الجهاز الوراثي)ی هەر خانایەکی لەشی پێك‌هێناوە ! ! ! .

بەڵام ئەوەی هیوامان پی‌ی هەیە ، ئەوەیە کە لەم ساڵانەی دواییدا توانرا تا ڕادەیەك وە لە سنوری ئەو زانیاریانەی کە هەمانە ، دەست‌بگیرێ بەسەر ئەم نەخۆشییەدا ، ئەویش بە چارەسەرکردنی نەخۆشەکان بە :

۱ – رەخساندنی باری ژیانی خۆش .

۲ – پێش‌کەش‌کردنی خواردنی باش .

۳ – دوورخستنەوەیان وە چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشیانەی کە میکرۆبەکەیان (مُعدی : درمی‌یە) و ئەبێتە هوی کەم‌کردنەوەی ڕێژەی گازی ئۆکسجین لە خوێن‌دا .

سەرچاوە :

۱ – مجلة العربي : العدد ۲٦۰ تموز ۱۹۸۰ ص ٤۸ – ۵۲

ئەم باسە دکتۆر عبدالمحسن صالح لەژێر ناونیشانی (خطأ النواة الوراثية – حد فاصل بين الموت والحياة)دا نووسیویەتی .

رەچەڵەك : الوراثة ، بۆماوە

پەرلە : شفرة

ئەنیمیا = کەم خوێنی : فقر الدم

ئەمینۆ ئەسید = ترشی ئەمینی : حامض الأمين

شریتی رەچەڵەکی : الاشرطة الوراثية

ناووکی شانە = ناووکە شانە : نواة الخلية

کیمیای ژیواری : الكيمياء الحيوية

موولوولەی خوێن : الشعيرات الدموية

گەردی پرۆتینی : الجزئي البروتيني

گەردی ناتەواو = گەردی هەڵە : الجزيء الخاطئ

کارلێك کردن : تفاعل

# ئێکسپرێشنیزم چی یە ؟

نوسینی : جۆزیف ئێملی مۆیلەر
ئازاد حمد شریف
لە ئینگلیزی‌یەوە کردوویە بە کوردی

بەشی یەکەم

Expressionism

ئەگەرچی پەنجا ساڵێك زیاترە زاراوەی ئێکسپرێشنیزم بۆتە بنیشتە خۆشەی بن ددانی خەڵکی ، کەچی تا ئێستاش بەتەواوی پێناسە نەکراوە . ئەمەش لەبەر ئەوەیە مانا بنچینەیی‌یەکەی ئەم‌زاراوەیە لەوەی ئەمرۆ دراوەتە پاڵی تەواو جیاوازە لە ساڵی ١٩٦٦ دا ، دۆناڵد .ی . گۆردن . پسپۆری ئەمریکی لە مێژووی هونەر . ووتارێکی لە (Journal of Warburg aand Courtland Institutes) دا بلاوکردەوە . لەم ووتارە دا گۆردن دەست نیشانی ئەوەی کرد کە یەکەم کۆمەڵە نیگارکێش خۆیان لەژێر ناوی (ئێکسپرێشنیست)ەکان دەرخست بریتی بوون لەوانەی کە لە پێشانگای (Neue Secession)ی (بەرلین)ی ساڵی ١٩١١ دا بەشداریان کرد . جا ئەمە تەنها ئەو نیگارکێش‌و پیاوە فەرەنسیانەی لە پاریس دا دەژ دەگرێتەوە ، بەتایبەتی براك Braque ، دیران Derain ، فرایسز Friesz ، مانگوین Manguin ، مارکێە Marquet ، پیکاسۆ Picasso ، پەی Puy . ڤان دۆنگن Ban Dongen ، و ڤلامینك Blaminck .

لەبەر ئەوەی زۆربەی هەرەزۆری ئەو کارە هونەری‌یانەی لەم پێشانگایە خرانە روو لەمابەینی ساڵانی ١٩٠٧ و ١٩٠٩ کێشرا بوون . جا پێویستە بەشی هەرە زوزیان خۆیان لە مابەینی هەردوو بزوتنەوەی فۆڤیزم (Fauvism) و کیوبیزم Cubism دەبیننەوە ، خۆ دەشێ ئەم کارە هونەریانە پەردە لەرووی ئەو کاریگەری‌یەی سێزان Cezanne کردویە تیە سەریان هەڵماڵن . بەڵام دەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین کە زاراوەی (ئێکسپرێشنیست) لەلایەن هیوارث ڤالدن (Herwarth Walden) بۆ ئەو نیگارکێشە فەرەنسیانەی کە کارە هونەری‌یەکانیانی لە هەیوانەکەی خۆی (Der Sturm)دا خستنە روو بەکار هێنا . هەر لە هەمان ساڵێشدا ، هەمان زاراوە لە کەتەلۆگی پێشانگای مەزنی هونەری هاوچەرخ دا ، کە لەلایەن سۆندەربەندا Sonderbund لە کۆلۆن Cologn دا رێکخرا . دووبارە بۆوە .

ـلاە ئەم جارە ئەو زاراوەیە بۆ وەسف ـرنی کارە هونەری‌یەکانی گۆگان Gauguin وسێزانو کرۆس Cross ، ـسیـێـ Signac ، بۆنار Bonnard ، ڤیلار Vuillard ، ماتیس Matisse ، ـکمنۆ ، براك ، ڤان گۆخ Van Goch ، ـونش Munch ، ڤلامینك ، هیکل Heckel ، گێرشنەر Kirchner ، شمیت - رۆتلۆف Schmidt – Rottluf ، کۆکۆشکا KoKoschka . . .هتد بەکار هێنرا .

بەکورتی ئێستا زاراوەکە هەموو ئەو هونەرمەندانە دەگرێتە خۆ کە بەهەردوو ـزی ریالیزمو ئیمپرێشنیزم دا تێپەڕیون ، جا گرینگ نی‌یە بە هەر ـرستەیەکدا ڕۆیشتبن .

لەبەر ئەوەی ئەم زاراوەیە ـەشێوەیەکی ئەوەندە فراوانو بەربلاو ـەکارهات ، بایەخو گرینگی خۆی لە دەست دا . جا ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە ـزۆر لۆژیکیانە باسی ئەم ڕەوتە بکەینو تەنها ئەو نیگار کێشانەی ئامانجی سەرەکی‌یان ـەتێك شێواندنی واقیعی بەرچاو دەربڕینی هەستو بیرکەو تێڕوانینەکانیان بە شێوەیەکی سەر سوڕ هێنەرا نەبوو ، بە ئێکپرێشنیست دابنێین ، نەك ئەوانەی ئامانجی سەرەکیان لەتێك شێواندنی واقیع مەبەستێکی وێنەیی بوو وبەس .
دووەمیان : لەکارە هونەری‌یەکانی ئێکسپرێشنیستە هاوچەرخەکان بارو دۆخێکی جیاکەرەوە هەیە : هەندێ جار ئەوان بەشێوەیەکی سەرەکی بالا کردنێکی پڕ لە پەرێشانی دەنوێنن ، بەلام زۆربەی هەرە زۆری ئەم نیگارکێشانە بارێکی پڕ لەنارەزایی ، سۆزی دوورەوولاتی و پەژارەیی دەخەنە ڕوو ، کە ئەم هەموانە لەپانای دلە ترسی‌و چەرمەسەری ، مێشك تێك چوون ، هەندێ جاریش لە گیانی یاخی بوونو نارەزایی ، یا تاوانبارکردنێکی زۆر بەزەبر خۆیان دەنوێنن .

جا کارەکانیان بەزۆری مۆرکی دلگوشرانو دلتەنگی‌و خەفەتباری‌یان پێوە دیارە . ئینجا ئەمەش یا پڕ سۆزو خرۆشە یا پڕی تورەییو توندو تیژیە .
لە کاتێکدا کە ئێمە بەم جەشنە پێناسەی ئێکسپرێشنیزم دەکەین ، هەر چونێك بێ دەبێ دان بەوەدا بنێین کە ئەم کێلگەیە تا ئێستا سنورێکی دیاری کراوی بۆ دانەنراوە . لە ڕاستی دا زۆر زەحمەتیشە ئەم سنورانە دا بنرێن چونکی نوێنەرەکانی ئێکسپرێشنیزم بە دوورە پەرێزی پێ نەگەیشتن ، بەلکو بەبەردەوامی پەیوەندیان لەگەل شۆڕە سوارانی ڕەوتە هاوچەرخەکانی تر هەبوو . جا ئێمە دەتوانین لە هەندێ بارو دۆخدا پەیوەندی ئەم بزوتنەوەیە لەگەل فۆڤیزمو لە هەندێ کاتی تر دا لەگەل فیوچەریزمو کیوبیزم ، هەروا لەگەل سوریالیەکانو ڕێکخەرانی هونەری تەجریدی دەست نیشان بکەین . بە پێچەوانەشەوە ، هەندێ جار دەبینین هەندی نیگارکێش پەیوەندی‌یەکی لابەرلایان لەگەل ئێکسپرێشنیستەکان هەیە ، لەگەل ئەوەشدا بە جەمسەرێکی ئەم بزوتنەوەیە دادە نرێن .
هەربۆیەکاش جێگای سەرسوڕمان نی‌یە کەپولێن کردنی چەند هونەرمەندێکی دیاری کراو مەسەلەیەکی یەگجار ئالۆزەو کۆمەلێك دەمەتەقەو لێکۆلینەوە دەخولقێنێ : تەنانەت زاراوەی (ئێسکسپرێشنیزم)یش کۆمەلە هەلسو کەوتنێکی جیاواز ناگرێتەوە ، نەخەسەلە لە کاتێکدا ئێمە نەك تەنها ڕووبەڕووی تاقە بزووتنەوەیەك دەبینەوە ، بەلکو کۆمەلە کەسێکی لێك دابراو کە زادەی کاتو ساتو شوێنەواری جیا جیان .

هەر چونێك بێ دەتوانین ئێکسپرێشنیستەکان بکەین بە دووبەش : کۆمەلەی یەکەم بریتین لەوانەی کە پشتگیری لە دەربڕینی لەخۆوە دەکەن : دووەمیان ئەوانەی کە دەلێن هەر کارێکی هونەری پێویست بە لەسەرخۆیی‌و وردەکاری دەکات . وەك یاسایەکی گشتی ، کۆمەلەی یەکەم لە سەرخۆ گەشە دەکات ، بەلام هەرکە کەمتر هەست بە مێشك ئالۆزی‌و بیرشاشی‌و گیانی یاخی بوون دەکەن ، کارە هومەری‌یەکانیان لەمەودای مەندی‌و پیرەو گەری دا خۆ دەنوێنێ . سەرباری ئەمەش ، ئەگەر بێ‌و پیکاسۆو هاوڕێکانی‌و نیگارکێشە تەجریدی‌یەکان بەلابنێن ، پێویستەدان بەوەدا بنێین کەهیچ یەکێك لە ئێکسپرێشنیستەکان خۆی بە نوێ کردنەوەی شێوە خەریك نەکردووە . دەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین کە ئەم نیگار کێشانە بە چەشنی بوومە لەرزەپێو گشت هەلچوونو نەهامەتی‌و نارەزایی ناخی مرۆڤ لەژێر پالە پەستۆی واقیعی ئەم سەردەمە تۆمار دەکەن . لە کاتێکدا هەندی هونەرمەندی هاوچەرخی تر هەستێکی نیمچە گەش‌بینانە بەرامبەر بەژیان لەکارەکانیان دا ڕەنگ دەدایەوە . بەلام ئەوەی ئەم پەرتووکە لێیان لەکارەکانیان دا ڕەنگ دەدایەوە . بەلام ئەوەی ئەم پەرتووکە لێیان دەدوێ تەنها بریتین لەوانەی کە چەرمەسەریەکانی

مرۆڤ کاری یێ کردوون ، نەك سەرکەوتنەکانی چونکی ئەوان بەبەردەوامی پێمان دەڵێن لەم ژیانە دا گەلێ شت هەن هەڕەشەمان لێ دەکەن‌و ئازارمان دەدەن . هەروەك چۆن ئەو جیهانەی تێیدا دەژین زور جاران رووبەرووی هەندێ باری وامان دەکاتەوە کە شلەژاوو دلتەنگ‌و یاخی ببین . خو ئەمەش شتێکی سروشتی‌یە کە دەبێ ئێکسپرێشنیزم گەشەی کردنی‌و چەندین شێوەی لەیەك نەچووی بەخۆیەوە دی پی تاوەکو گەیشتە ئەو ئاستەی کە بوو بە یەکێك لە گەورەترین ڕەوتەکانی هونەری هاوچەرخ . ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەمە دیاردەیەکی نوێ‌یەو تەنها سەر بەم چەرخەی ئێستایەو لەوانی تر نامۆیە ؟ بەهەر شێوەیەك بێ دەبێ بڵێین‌کە ئەمە ڕەوتێکەوهەزاران ساڵیش لەمەو پێش بە بەردەوامی دەرکەوتووە . بەلام خۆری پڕ شەوق لە ئاسمانی هونەر ماوەیەك گیراو پاشان دیسان یەر لەنوێ بوژایەوە . خۆ ئەوە ڕاستەکەئەم ڕەوتە هەمیشە لەهەمان بەرگ‌و ڕوخسار دا خۆی نەنواندوەو هەمان باری ئالۆزی مێشکی ڕەنگ نەداوەتەوە .

بەلام ئەم رەوتە ڕوخساری ئاسایی هەموو شتێك بەبێ دوو دلی دەکاتە قۆچی قوربانی گوزارشتە کردنی هەندێ واقیعی ناوەوەی مرۆڤ بەشێوەیەکی چروپر ، ئەو واقیعە مەزنەی کە لەمێشك یاروح ڕەگی دا کوتاوە .

تەنانەت بگرە لەپێش مێژووش هەندێ کاری هونەری واهەن کە دەتوانرێت بە ئێکسپرێشنیست دا بنرێن . بۆ نمونە وێنەی (ویندۆرف ڤینۆس) بە چاکترین نمونەی ئەم مەبەستە دادەنرێت . هەر کە مرۆڤ سەیری ئەم کارە هونەری‌یە دەکات هەست بە ئارەزوویەکی ئێکسپرێشنستانە دەکات . چونکە لەم کارەدا ئاکارەکانی ئافرەت زێدەڕەوی تێدا کراوە بە بێ ئەوەی گوێ بدرێتە شیان یا جوانی ڕووخسار یا تەبایی تووخمەکان لە پێکهاتندا . تەنها بۆ ئەوەی هەندێ شتی بنچینەیی بخرێتەڕوو . سەرباری ئەمەش . ئێمە هەست بە بوونی ئەم ڕەوتە نەك تەنها لە هونەری سۆمەری‌یەکان بگرە لە هی چاخەکانی ناوەڕاستیش دەکەین . با ئاورێك لەهونەری بێزەنتینی بدەینەوە . هەر لە شادەم‌و چاوترش‌و تاڵەکان . فەیلەسوفە لمووز تورگانی‌یەکان‌و مووژدە دەرە سەرلێ شێواوەکانی ئیبان میسال (Ebban Missal) ورایمز (Reims) ەوە بگرە تا ئەو دیمەنە بروتریانەی سەر دەرگای کاتدرائیەی هیلدئایم (Hildesheim) و کەنیسەی سانزینۆ (San Zeno)ی ڤیرۆنا (Berona) چاکترین بەلگەی ئەم قسانەن . خۆ مەسیحی لەخاچ دراوی سەردەمی ڕۆمانی لە ئەلمانیاو ئیسپانیاو تابلۆی (Devot Christ) ی پێریگنان (Perpignan) و داوێن‌پاکە خاوەن چەرمەسەری و مەسیحە جەستە تێك شکاوە . لەش داماڵراوە . ئێسك و پروستەکەی پیتاس (Pietas)ی سەدەکانی ١٦ – ١٧ هەمیش هەرهەمان ڕاستیان بۆ ئاشکرا دەکەن .

زۆربەی ئەم کارانە لەدەستکردی ئەلمانەکانن ، بگرە ئەلمانیا مالێ ئەم مامۆستا کۆنانەبوو کە زۆر لە ئێکسپر یشنیزم نزیك بوون : گرون ڤالد (Grune Wald) ، میگارکێشی تابلۆی لە خاچ‌دان ، لە قوربانگەی ئیزنهایم (Isenheim) لە کۆلمەر (Colmer) دا ، وێنەی مەسیحێکی ساویلکەی کێشاوە . لەم تابلۆیەدا مەسیح بەهۆی دارکاری‌کردن پێستی لەشی داماڵراوەو بەرامبەر بە ئاسمانێکی چۆڵ‌و هۆل وەستاوەو سێبەرێکی خۆسەپێن لە هەموو لایەکەوە دەوری‌گرتووە . خۆ ڕەنگە توخمە ئێکسپرێشنیستەکان لە دواکارەکانی مایکل ئەنجلۆ ، بەتایبەتی لە تابلۆی (دوا لێ پرسینەوە)ی کەنیسەی سێستین (Sistine) یا ئەوانەی تینتۆریتۆ (Tintoretto) دا ، بەلام لەهەموو ئاشکراتر لە تابلۆکانی ئالگریکۆدا (El. Greco) بەدی دەکرێن . ئەم هونەرمەندە جەستەی مرۆڤ . تێك‌دەشێوێنی‌و درێژکۆلەو لاوازو باریکەلەیان دەکاتەوەو شێوەی بلێسەی بەردەم ڕەشەبای پێ‌دەدان . تەنها بۆ ئەوەی لەم ڕێ‌یەوە بیرکەو پەرۆشی‌یە ڕۆحی‌یەکانی دەربرێ .

تەنانەت ڕامبرانت (Rambrandt)یش لە دواکارە هونەری‌یەکانی . بۆ نمونە ، هەندێ لە خودەوێنەکانی‌و تابلۆی پلانی (جۆلیەس سیڤلیس)دا . نیمچە ئێکسپرێشنیستە . ئالێرەدا ڕامبرانت لێکدانەوەی سەربەستی ناخی مرۆڤ لەجی‌ی خۆخەریك‌کردن بە سروشتی رووخساری دەرەوەی مرۆڤ‌و ئەندام ڕێك‌وپێکی داناوە ، جا ئەم هەستەشیان بەهۆی مامەڵە بەربلاوە ، بەلام ڕاستەقینەکەی ، پێ‌دەگەیەنێ . دەتوانرێت هەمان زاراوە بدرێتە پال تابلۆکانی گۆیا (Goya) ، نەخسەلە ئەوانەی ـکە بۆ ڕازاندنەوەی ماڵەکەی (Quinta del Sordo) (مانای : مالی پیاوێکی کەڕ) دا دروستی کردوون . ئەم هونەرمەندە هەولی‌دەدا ڕوانگەکانی . لەرێی جەختکردنەوەی کەسایەتی بە سەیرو پەشێوەکانی دەربخات . جا هەر ئەمە

بوو پاڵی پێوەنا کە ڕەنگە خۆڵەمێشیو ڕەشە تۆخەکانو جارناجارێکیش لێرە یالەوێ نووکە ڕەنگێکی شین یا سووری گەش بۆ ڕازاندنەوەی تابلۆکانی بەکاربهێنێ. ئەم چەشنە مامەڵەکردنەوەی گۆیا لەگەڵ تابلۆکانی، هەرچەندە وەك دیمەنێکی گاڵتەجارانە خۆدەنوێنێ، بەڵام لەڕاستیدا یەگجار گوزارشتکەرە، چونکە لەپەنای ئەمانەدا تووخمە وورژاوە هەڵچووە شەیتانییەکەی وێنەکان دێنەقسە. گەلێ لە ئێکسپرێشنیستە هاوچەرخەکان بەرامبرانت و گۆیا دڵگیربوون. بەڵام دەبێ ئەوەشمان لەیادبێ کە ئەوان دۆمیێ ی (Dumier) یان هەڵسەنگاندووە. یەکەمیان: چونکی ئەو خۆی بەدەرخستنی ئاکارە هەرە دزێفێنەکانی مرۆڤ یا دیمەنەکانەوە خەریك کردووە. دووەمیشیان: لەبەر ڕەخنە توندو تیژە کۆمەلایەتی یە ئەخلاقی یەکەیو هەڵوێستە پڕنارەزاییو یاخی بوونە مرۆڤانەکەی نێو تابلۆکانی.

لەمەش زیاتر، ئێکسپرێشنیزمی هاوچەرخ بەهۆی چەشنەها شێوەی سەمەرەو سەرەتایی یا هونەری ڕەمەکی، کە شوێنپێ ی خۆی لە (مۆزەخانەی ئەندێشەیی) سەدەی بیستەمدا کردەوە، هاندرا: بگرەچەندین دەمامكو پەیکەری هەمەجۆرو هەڵکۆڵراوەکانی ئەفریقیای قوولەڕەشەکانو ئەمریکای پێش کۆلۆمبیو چەندین شتیتریشی تێدا خراوەڕوو، جا ئەمەش لە کۆتاییدا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەلایەن چەند هونەرمەندێکی. سەدەی نۆزدەهەم پەنجەی بۆ کێشراو پەردە لە ڕووی هەڵمالرا. من لە ئەڵمانیا ووتم جارێکیان سێزان خرا مابەینی ئێکسپریشنیستەکان. جا ئەگەر یەکێك بڵێ ئەو سەربەم ڕێبازە نەبوو، دەبێ دان بەوەدا بنێین کە سێزان یەکێك بوو لەوانەی ڕێگای بۆ سەرهەڵدانی ئەمڕێبازە خۆشکرد. ئەگەربێو خۆمان لە ڕیالیزمی ئیمپرێشنیستەکان دابڕین، دەتوانین بڵێین کە ئەم بزوتنەوەیە لە بنچینەوە لەلایەن ئەو هەموو نیگارکێشانەی کەڕەنگی خەفەت نوێنو ڕەنگ چۆوەیان بەکاردەهێنا. پشتگیری لیکرا. هەر لەگۆگانەوە بگرە تۆلۆز لۆتریك Toulouse-Lautrecو ڕیدۆن Redon و هۆدلەر Hodler ی سویسریو سۆرا (Seurat)و تەنانەت نێو ئیمپرێشنیستەکانیش. بەڵام گەربێو باسی باپیرەگەورە ڕاستەقینەکانی ئەمە بکەین دەبێ تەنها ناوی ڤان گۆخو ئەنسۆر Ensorو مونش Munch بێنین. کەواتە پاش ئەوەی کەزانیمان یەکەمیان هۆڵەندیو دووەمیان بەلجیکی و سێهەمی یان نەرویجی بوو. ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە ئێکسپرێشنیزم بەرامبەر بە میزاجی فەرەنسی نامۆبوو. ئەوەی گومانی تێدانی یە ئەوەیە کە وولاتە ئەڵمانییەکان چاکترین لانەی پێگەیاندنی ئەم بزووتنەوەیەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ نیگارکێش لە فەرەنسا چ بەبەردەوامی و چ جار ناجارێك ئەم بزووتنەوەیان هەر لەسەرەتاکانی ئەم سەدەیەدا، بگرە تەنانەت پێش ئەوەی ئەم بزووتنەوەیە لە ئەڵمانیادا سەرهەڵبدات. دەنواند، خۆ ڤلامینك هەر لە ساڵانی زووی (١٩٠٠)ەکانداو ڕۆوەش لەساڵی (١٩٠٣) دا کاری ئێکسپرێشنیستی یان بەرهەم هێناوەو چاکترین نمونەی لە دایكبوونی ئەم بزووتنەوەن. ئەوەی ڕاستیبێ ڕەوتێکی بەهێز یا بێهێز لەکاری ئەو نیگارکێشە پاریسیانەی. کە لە نەژادێکی بێگانە بوون. دەبینرا: خۆ ئەو ڕەوتە لەکارەکانی ڤان دۆنگنی هۆڵەندی، کوپکای Kupka بوهیمی. تشاگاڵ Chagall ڕووسیو پیکاسۆی ئیسپانی بەئاشکرایی دیارە. سەرباری ئەمەش ئەو نیگارکێشانە سەر بە هیچ کۆمەڵەیەك نەبوون (بێجگە لە ڤلامینك و ڤاندۆنگن کە هەردووکیان فۆڤ بوون): خۆ نەلەوێ ئەم بزووتنەوەیە هەبوو و نەدەشیێ.

کە چی ئەوبارە لە ئەڵمانیا جیاوازبوو پێش ساڵی ١٩١٤ دوو کۆمەڵە پێکهات: کە هەریەکێکیان لەڕاست خۆی پڕوپاگەندەی بۆ ئەم بزووتنەوەیە دەکردو ئەویشی دەنواند. یەکەمیان کۆمەڵەی پرد (Die Vruke) بوو کە لە ساڵی ١٩٠٥ لەلایەن چوار قوتابی هونەری تەلارکاری لە شاری درێسدن (Dresden) دا دامەزرا، ئەم چوارەش کێرشنەرو بلایلو هیکلو شمێت ڕۆتلۆف بوون. بەڵام هەرزوو بەزوو نۆڵدە Nolde و پێکشتاین Pechsteinو ئۆتۆمۆیلەر Otto Muller و چەند کەسێکی تر هاتنە پاڵ ئەم کۆمەڵەیە. بەڵام دووەم کۆمەڵە لەساڵی ١٩١١ دا لە ژێر ناوی سواری شین Der Vlaue Reiter لە میونغ پێکهات. ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە بریتیبوون لە کاندینسکی Kandinsky، ماك Marc و ماکە Macke، کامپیندۆك Campendonk و کلیێ ی Olee. بەڵام قسەیخۆمانبێ ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە بەقەد ئەندامانی کۆمەڵەی پرد ئێکسپرێشنیست نەبوون لە دەربڕیندا. بێجگە لە کاندینسکی کە ئێمە بەتەواوی قەرزاری داهێنانەکانی ئێکسپرێشنیزمی تەجریدی ئەوین، لەپاڵ ئەو کۆمەلانەشەوە چەند کەسێکی سەربەخۆ

هەبون وەك رۆڵفز (Rolfs) و مایدنەر Meidner لە ئەڵمانیا ، گیستێل Gestel و کۆکۆشکاو شیلێ Schiele لە نەمسا ، جا هەموو ئەم نیگار کێشانە لە بەپیت‌کردنی ئەو بزووتنەوەی کە ئێمە لێی دەکۆڵینەوەو ئەم وولاتانە لەدێرە زەمانەوە شارەزایی‌یان لێ‌پەیدا کردووەو هاوبەشی‌یان کردووە .

لە ساڵی ١٩١٣دا کۆمەڵەی پرد تەفرو تونابووو ئەندامانی کۆمەڵەی سواری شینیش بەهۆی جەنگی (١٩١٤)ەوە لێك دابران . کەچی ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئێکسپرێشنیزم کۆتایی پێ‌هات . بەڵکو بەپێچەوانەوە ، جەنگ ، بەهۆی دووقات کردنەوەی بارە درامی‌یەکانو ووڕژاندنی بارە دەروونی‌یە شێواوەکانو خستنەرووی بارە دەروونی‌یە شاراوەکان ، جۆرە هونەرێکی وای لەگەڵ خۆی هێنا کە بە دڵەراوکێو چەرمەسەری فرچکی خواردبێ ، هەر بەم پێ‌یەش بریی چەند نیگارکێشێکی ئێکسپرێشنیستی وەك کێرشنەرو کۆکۆشکای کولاندەوە . ئەم بارە شپرزەو نالەبارە لەناخی هەندێ هونەرمەندی تربووە هۆی وەرژاندنو بەهێزکردنی دڵەترسێ وەك ئەمە لەکاری ئەڵمانی‌یەکان بۆنمونە : بەکمان Veckmannو دیکس Dixو گرۆس Groszو لە فلیمینگەکان پەرماك Permekeو ڤان‌دین بیرك Banden Verghe و گۆستاڤ‌دی شمێت دەبینین . لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین کە ئەو وێنەو نیگارانەی کە ئەو واقیعە خویناویەی ئەو سەردەمە راستوخۆ رەنگ دەدەنەوە کاری زۆر ناوێزە و دانسقەن : چونکی ئەو هونەرمەندانە خۆیان بە دەرخستنی باری مێشك نەك لێکدانەوەی رووداوە مێژوویی‌یەکان خەریك دەکەن . بەگشتی کارەهونەریەکانیان رەنگ‌دانەوەی ئەو شەرو شۆڕەن نەك لەرێگای ووڕژاندنی دیمەنە خویناوی‌یەکان بەڵکو لە رێگای چڕ کردنەوەی دڵگوشرانو خەمو مەینەتو یاخی‌بوون .

سەرباری‌ئەمە ، دەبێ هەوڵ‌بدەین هەموو شتێك بەم جەنگە نەبەستینەوە . چونکی خۆ هەمووومان دەزانین کە یەکەم شەپۆلی ئێکسپرێشنیزم ، لەکاتێکی پڕئاسایشدا ، پێش ساڵی ١٩١٤ سەری هەڵدا . دووەم شەپۆلیش کە پاش ساڵی ١٩١٨ دا بەسەر ئەورووپادا تێ‌پەری ، کۆمەڵە شۆڕەسوارێکی وا دەگرێتەخۆ کە رەوتی کارە هونەریەکانیان لەخود یاباری ژیانی خۆیانەوە هەڵدەقولا . هەرچۆنێك لێکی بدەینەوە ، دەبێ دان بەوەدابنێین کە ئێکسپرێشنیزمی ئەڵمانی لە ئەنجامی شارەگەورەو قەڵەبالغەکان هاتەکایەوە ، هەر بۆیەکاش واقیعێکی درندانەو دڵتەنگ‌کەرو سەرلێ‌شێوێنەر بەخۆیەوە دەگرێ ، کەچی ئەو رەسەنایەتی‌یەی لە فلاندرز Flanders دا دەبینرێ لە ئەنجامی ئەو پەیوەندیە بەهێزەی لەگەڵ وولاتی فلێمیش Flemishدا هەیبوو هاتە کایەوە . جا ئەمەش ئاکارێکی لادێ‌یانە لەکارە هونەری‌یەکانی ئۆبر جۆنیس Auber Jonoisی سوێسری‌و سلیترز Sluyters ، گێستیل Gestel ، چارلی تۆرۆپ Charley Toorop ، کرۆیدر Kruyder ، چابۆت Chabot ی هۆڵەندی‌دا دەنوێنێ . بەڵام لەمابەینی هەردوو جەنگی جیهانی‌دا ئەم بزووتنەوەیە هەندێ رووخساری‌تری بەخۆیەوە گرت ، نەخەسەلە لەکارەکانی کۆتور Kutter ی لۆکسەمبۆرگی‌و بۆکێل Vockelی نەمساوی‌و سۆلانا Solana ی ئیسپانی‌و رۆسای Rosai ، سکیپونا Scipione و بەتایبەتی سیرۆنا Sironiی ئیتالیێ بە ئاشکرا دەبینرا . هەر لەهەمان کاتیشدا ئەم رەوتە لەمەکسیك ، بە شێوەیەکی دیارو هەست‌پێ‌کراو لە کارەکانی ئۆرۆزکۆ Orozco ، سیکۆرۆز Siqueiros و تەمایۆ Tamayo دا ، دەستی‌کرد بەگەشەکردنو نەش‌ونما . هەروەها لە پاریسیشدا پشتیوانەکانی تەواو زیندەبوون . بەڵام هیچ یەکێك لە گرۆمێر Gromaire ، لە فۆکۆنیر La Fauconnier ، جۆرج Georg ، لە پاتلیر La Patelliere و فۆتریر Fautrier نەیان توانی دەسەڵاتی رۆوە یا سفت‌و سۆڵی‌یە زەمینی‌یەکەی کۆمەڵەی فلێمیش لەکارە هونەری‌یەکانیان بنوێنن . ئەگەر سەرنجێکی تازە هاتووەکانی فەرەنسا بدەین ، تەنها سۆتین Soutine ی لانەواز بەهێزترین رەوتی ئێکسپرێشنیستی لەگشت نیگارەکانی دەنواند . هەندێ لانەوازی تری وەك (مۆدلیانی Modigliani و پاسکین Pascin . . هتد) سۆزی جولەکەیان، لەکارەکانیان دەخستەروو . بەڵام کارەکانی ئەوان نەبەقەد ئەوانەی سۆتین دڵەخورپەو ئازارەکانی مرۆڤ دەردەخەن ونەتووخمە ئێکسپرێشنیستەکانیان ئەوەندەی ئەو کارتێ کەرن .

لەساڵی ١٩٣٧دا پیکاسۆ رووی‌کردە لێکدانەوەی بەدەست هێنانەکانی کیوبیزم بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی تەواو بن برانە هەستی‌خۆی بەرامبەر بە شەری براکوژی ئیسپانیا دەربرێ . هەر بەم‌پێ‌یە پیکاسۆ بەشداری سەرهەڵدانی ئێکسپرێشنیزمی رەمزی‌کرد ، ئەو رەوتەی کە نوێ‌تر بوو لەوەی لەسەرەتاکانی ئەم سەدەیە بەم ناوە ناسرابوو . جا ئەمەش بەشێوەیەکی کاتی لەکارەکانی ئیستیڤ Esteve(١٩٣٩) ، لە

موال La Moal ، چاستیل Chastel و له دوایشدا لەکاری چەندین نیگارکێشی تر دۆزرایەوە ، بەلاّم ئەمە بەشێوەیەکی تەواو هەست پێ‌کراو لە کارەکانی پیگنون Pignon دەبینرا . لەمەش زیاتر ، سێهەم شەپۆلی ئێکسپرێشنیزم لەگەڵ یا لەدوای جەنگی ١٩٣٩ – ١٩٤٥ هات . بەلاّم ئەوانەیە دیسان هونەرمەند کەمتر خۆی بە ڕووداوە دەرەکی‌یەکان خەریك بکات ئەوەی بە دراما تایبەتی‌و تێك‌شێوانی سایکۆلۆژی سروشتە پاکەکەی خۆی . لەهەموو بارەکاندا ، دەتوانین بڵێین کە هەموو ئەو تابلۆیانەی لەو ماوەیەدا کێشرابوون پەیوەندی‌یەکی سفت‌و سۆڵیان بەوانەی سالاّنی زووەوە هەبوو . هۆی ئەمەش ، لەپاڵکاریگەری پیکاسۆ ، ئەوەیە کە ئێکسپرێشنیزمی ڕەمزی بووە داردەستی سوریالیزم‌و تەنانەت هونەری تەجریدیش ، تا ئەو ئاستەی کەمتر واقیعی‌و زیاتر تەم‌و مژاوی خۆی نواند . وێرای ئەم هەمووەش ، ئێکسپرێشنیزمی تەجریدی زیاتر پەرەی سەند لەوەی لەوەو پێش هەبوو .

یەکێك لە ئاکارە سەرەکی‌یەکانی باری نوێ ئەوەبوو کەماکە نەتەوەیی‌یەکانی کارە هونەری‌یەکان بەرەو نەمان دەچوون‌و ملی هەرکۆمەڵە ئێکسپرێشنیستێکی دوای جەنگی (١٩٤٨) ت بگرتایە ، بێ‌گومان ماکی‌جیهانی بەخۆیەوە هەڵگرتبوو ، هەروەك بەوناوەی لە خۆی نابوو دەردەکەوێ ، کۆبرا : کە لە سێ ناوی جیا جیا پێك هاتبوو : کۆ (پنهاگن) و بر (ەسلیز) و ئە (مستردام) ، جا ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە بریتی‌بوون لە ئەلشینسکی Alchinsky بەلچیکی ، جۆن (Jorn) و پیدەرسن Pedersenی دانیارکی‌و ئەپیل Appel و کۆرنیل Corncill و قونستەنت Constant ی هۆڵەندی . جا کارە هونەری‌یەکانی ئەم کۆمەڵەیە لەسەر ئەوسنورەی مابەینی ڕەمزیەت‌و تەجریدیەت‌دا خۆی دەبینێتەوە . خۆ سەرنجدان لە کارە هونەری‌یەکانی گروبیر Gruber و لۆرجۆ Lorjou ی فەرەنسی ، گەبلەر Gubler ی سوێسری و لەندیت Landuyt ی بەلچیکی‌و شتۆفیلی Stoffel لەکسەمبۆرگی ، دەبینین کە ئێکسپرێشنیزمی ئەوانە تەواو نزیکە لەوەی پێش ساڵی ١٩٤٠ کەچی هەندیکی تر لە نوێنەرانی ئەم ڕەوتە زیاتر داهێنانی شێوەیی یا تێك شێواندنی بناغەیی دەنوێنن . ئەمەش لە فرەنسا لە کارەکانی پیگنەن ، ڕێبی رۆلە Rebey rolle ، گیلەت Gillet ، ماریان Maryan و وۆلز Wols دا ، کەچی لە ئینگلتەرە لە کارەکانی بێکن Vacon و سوثەر لەند Suther land ، لە ئەڵمانیا لە کارەکانی ئەنتیس Antes ، لە ئیسپانیا لە کارەکانی سوارە Suara ، هۆڵەندا لە کارەکانی لوسبێرت Lucebert و ئەمریکاش کونینگ Kooning دا بە ئاشکرایی دیارە .

ئەوەی دەتوانین دەربارەی ئێکسپرێشنیزمی تەجریدی بڵێین ئەوەیە کە پسپۆرەکانی ئەم ڕەوتە لەسالاّنی ١٩٥٠ کاندا لە ژمارە نەدەهاتن ، جا ئەمانە پەرەیان بەم‌ڕەوتە خست‌و لەگەڵ هونەری نیگارە پڕ جم‌و جۆڵەکانیان لێك‌دا . ئەوانەی لە پاریس سەر بەم ڕەوتەبوون بریتی بوون لە هارتونگ Hartung ، برام ڤان ڤێلدە Vram yan Welde و بگرە تەنانەت وۆلزو شنایدەریش ، بەلاّم قەت تاقێ لەمانە بەنەژاد فەرەنسی نەبوون . جا ئەمەش جێگای سەرسوڕمانی‌یە کە زۆربەی هەرە زۆری ئێکسپرێشنیستە تەجریدی‌یەکان لە دەرەوەی فەرەنسا ببینینەوە – لە ئەڵمانیا (سۆندەر بۆرگ Sonder Vorg ، ك . و . گۆتز K.O.Gotz ، پلاتشیك Platscheck و شۆماکە Schumacher) ، لە بەلچیکا (مۆرتیر Mortier ، برۆسینز Vrussens) ، لە هۆڵەندا (لاتاستەر Lataster) ، لە ئیتالیا (ڤیدۆڤا) و لە ئەمریکا (پۆلۆك Pollock و کلدین Kline) ، خۆ لەپاڵ‌ئەمانەوە دەتوانین چەند نیگارکێشی تریش دەست‌نیشان بکەین . هەڵبەتە ، ئەم نیگارکێشانە خاوەن یەك پلەوپایەی ئێکسپرێشنیستی نین ، چونکە هەریەکێکیان شێوازی تایبەتی خۆی هەیە ، هەروا هەندێکی تریان توانای نیگارکێشان‌و هێڵکاری لە خۆوەیان هەیە . خۆ هەندێکی تریشیان ڕەنگی گەش بەکاردەهێنن‌و ڕێگایەکی ئاڵۆزی دابەش‌کردنی ڕوناکی‌و سێبەریان هەیە . جا ئەگەرێ‌و تابلۆو نیگارەکانی ئەمانەو هونەرمەندە ڕەمزی‌یەکان پێکەوە وەربگرین ، ئەوەمان بۆ دەسەلمێ کە ئێکسپرێشنیزم تا ئێستاش ڕەوتێکی بەکارو هەمەجۆرە .

**مانای هەندێ وشەی گران**

**١ – ئێکسپرێشنیزم : تەعبیریەت .**

**٢ – فۆڤیزم : مانای بزوتنەوەی (الوحشیة) لەهونەر .**

**٣ – کیوبیزم : مانای بزوتنەوەی (التکعیبیة) لەهونەر .**

**٤ – ئیمپرێشنیزم : مانای (الأنطباعیة)**

**٥ – فیوچەریزم : مانای (المستقبلیة) .**

**ئەم وتارەم لە پەرتووکی**

**A dictionary of Expressionision**

**وەرگێڕاوە**

# هونەرمەند اسماعیل خەیات

**ناسینی ئەم هونەرمەندە**

— ساڵی ١٩٤٤ لە خانەقین لەدایك بووە .

— ساڵی ١٩٦٥ خانەی مامۆستایانی سەرەتایی بەعقووبەی تەواوکردووە .

— لە ساڵی ١٩٦٥ وە ئەندامی کۆمەڵی هونەرمەندانی تەشکیلی عێراقە .

— لە ساڵی ١٩٦٨ لەگەڵ طالب العلاق ، ستار نعمان ، مکی حسین دەستەی کۆمەڵی (البدایە) بووە .

— ساڵی ١٩٦٩ لە گورجو گۆڵیەکانی خوێندگە لە بەرێوەبەرایەتی پەروەردەی سلێمانی مەشق دادەر بووە .

— لە ساڵی ١٩٧٠ وە ئەندامی نەقابەی هونەرمەندانی عێراقە .

لەم پێشانگایانەی خوارەوەدا بەشداری کردووە :

١ — **ساڵی ١٩٦٥ لە پێشانگاکانی ساڵانەی (کۆمەڵی تەشکیلی عێراق) دا**

٢ — پێشانگاکانی ساڵانەی (هونەرمەندانی سلێمانی) و (پێشانگاکانی هونەرمەندانی کورد) .

٣ — **ساڵی ١٩٦٨ لە** پێشانگا گەڕۆکەکانی هونەری عێراق لە یەکێتی سۆڤیەت و ئەورووپای ڕۆژهەڵات .

٤ — **ساڵی ١٩٦٨** لە یەکەم پێشانگای کۆمەڵی (البدایە)

٥ — **لە ساڵی ١٩٧٢** لە پێشانگای گەڕۆکی (لە دیوار دراوەکانی **کوردی یەکەم) لە** بەغداو هەولێرو سلێمانی .

٦ — **١٩٧٣ لە پێشانگای** فراوانی هونەری عێراق .

٧ — ساڵی **١٩٧٤ لە پێشانگای** «الستین»ی عەرەبی یەکەم — البینالە — **لە بغداد** —

٨ — ساڵی ١٩٧٩ **پێشانگای** تەشکیلیەکانی عێراق لە دمشق

٩ — ساڵی **١٩٧٩ لە** پێشانگای (نەخشەکێشانو دیعەنە سروشتیەکان) — **ی کۆمەڵەی** تەشکیلی عێراق .

١٠ — پێشانگای **هاوبەشی لەگەڵ** هونەرمەندی کورد عەلی جوڵا لە سلێمانی .

خاک، مرۆڤ، پێویستی و ناپێویستی هەرچەند ئەم جیهانە بەرەو
سامناکی بچێت ئەوەندە هونەر رووت دەبێتەوە یرلی کالی


ئەو پێشانگایانەی کە هەر هی خوین :
١ – ساڵی ١٩٦٥ یەکەم پێشانگای خۆی لە هۆڵی
مۆزەخانەی نیشتمانی دا کردۆتەوە .
٢ – ساڵی ١٩٦٦ پێشانگای دووەمی خۆی لە هۆڵی
کۆمەڵی تەشکیلی عێراقیەکاندا کرۆتەوە .
٣ – ساڵی ١٩٦٩ پێشانگای سێیەمی خۆی لە هۆڵی
قوتابخانەی (گۆیژە) لە سلێمانی سازکردوە .
٤ – ساڵی ١٩٧٠ پێشانگای چوارەمی خۆی لە هۆڵی
خانووی قوتابیان لە سلێمانی ئامادەکردوە .
٥ – ساڵی ١٩٧٣ پێشانگای پێنجەمی خۆی لە زانکۆی
سلێمانی .
٦ – ساڵی ١٩٧٥پێشانگای شەشەمی خۆی لە زانکۆی
سلێمانی
٧ – ساڵی ١٩٧٥ پێشانگای حەوتەمی خۆی – سلێمانی .
٨ ساڵی ١٩٧٥ پێشانگای هەشتەمی خۆی لە زانکۆی
سلێمانی بەبۆنەی ساڵی جیهانی ئافرەتەوە .
٩ – ساڵی ١٩٧٧ پێشانگای نۆیەمی خۆی لە هۆڵی
ناوەندی کوردستان لە سلێمانی بەناونیشانی «ئاواتەکان لە خاکا» .
١٠ – ساڵی ١٩٧٩ ! پێشانگای، دەیەمی خۆی لە سلێمانی
(٩٨) روو
پێویستی و ناپێویستی یە
لە کاتێکدا کە لە هەموو چەرخێکدا زۆربەی
نیگارکێشەکان بایەخی رەنگ بۆ (هونەرمەند)و ژیان



دەسەلمێنن. جا با لەم رووەوە یادی وتەکەی (دیلاکروا) بۆ نموونە لە (نیگار) (وێنە) دا بکەینەوە کە ئەڵێت رەنگەکان لە نەخشەکێشان گرنگترن. کەوابوو نابێت (فیرناند لیجیر) یشمان لەبیربچێت کە ئەڵێ «رەنگ بە پێویستی‌یەکی سەرەکی ئاوو ئاگر.. بۆ مرۆڤ دادەنرێ. کەرەسەیەکی خاوەو ژیان ناتوانێ دەست بەرداری بێ بەتایبەتی ئا لەم کاتەدا پێویستە ئاورێك لە (اسماعیل خەیات )ی هونەرمەند بدەینەوە سەبارەت بەو هەڵوێستەی کەهەر لە یەکەم جارەوە بەرامبەر بەرەنگ هەیەتی بۆ ئەوەی بزانین چ شتێکی سەیر ئەبینین.

ئەگەر باوەرمان هێنا کە رەنگ بوونی ئەندامێکی جوانیو درامی)یەو بە روناکی‌یەوە بەستراوەو بوونی روناکیش مەرجێکی پێویست بێ بۆ بوونی رەنگ ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە دورخستنەوەی رەنگ بەلای خەیاتەوە (کە بە ئارەزوو خۆی لە رەنگ دوورئەخاتەوە)جیهانێك بێ تاریکی دایپۆشیبێ..؟ یان خۆی بۆئەوە دووردەخاتەوە تاوەکو کراسەکەی لەکەدار نەبێ بەهۆی ئەو ژیانو خراپەکاریو تێکدانەوە کە ئەنجامی تێکەلاوی رۆژگاروو کیمیاگەری روودەدات کە ئەبێتە هۆی ئەو زیانە. کاکڵانەی ناو تابلۆکان.

ئێمە لە بەردەم (پێویستیو ناپێویستی)دا.. بەڵی ئێمە لە بەر دەم هونەرمەندێکا کە خەریکە بێرەنگ بێ (تابلۆ رەنگاوی‌یەکانی وێنەکەر) ئەبێ چی لەپشت ئەم شێوانەوە خۆی حەشاردابێ چ فەلسەفەیەك. چی؟

رەنگە ئاوازی سەیر سەبارەت بە رەنگ بۆ إ.خەیات دەرکەوتبێو وای لێ کردبێ کە قوربانی بدات بە رەنگە سەرنج راکێشەرەکانو پاشەکەوت کردنێکی بێ سنور بێ کەوا هونەرمەند ناتوانێ دەستبەرداری بێ بۆ چەسپاندنی ئەو شێوازە تایبەتیەی خۆیو وەدیهێنانی ئەو شتەی کە مەبەستێتی..

لەگەڵ زەقایەتی ئەم جۆرە هەڵبژاردنەدا إ.خەیات هاتووە رەنگی رەشو سپی‌ی تێکەلاو کردووەو بۆ دەرخستنی تواناکان ئەچێتە ناخەوەو دەست بەسەر تواناشیاندا دەگرێ کە دەربرینەو خواستی ئەوەیە کە لە رێی سێبەرێکەوەو لەپشت زمانێکەوە کە خەریکە تا ماوەیەکی زۆر دورو درێژ ئارامی لا بگرێ بۆ داهێنان. کە ئەمەش بە (پلەکان) گفتوگۆیە بە رەنگە هەمەچەشنەکان لە بنەرەتی یەك رەنگەوە. کە لێرەدا لەو شتانەدا خۆی دەنوێنێ کە لە رەنگی رەشو سپی جیابوونەتەوە، بەجۆرێك کە ئەندێشەی نایابی هونەرمەند والی‌ئەکات کە رەنگی رەش ماوەو تێپەربوو بەناو (مەوشور)دا زیاتر بکات. ئەم رەنگە رەشەی کە هەموو رەنگەکان لای ئەم هونەرمەندە لە خونچەیەتیو زمان رەوانیدا بەرەو هەڵبژاردنێك کۆبکاتەوە:

**هەموو رەش** Absolute Black
رەشی بێگەرد right Black
رەش – سپی Black – White
هەموو سپی Rbsolute White
سپی‌ی بێگەرد right White
سپی – رەش White Black





إ.خەيات له شێوه (Styllzation) هەڵبژاردنەکانیدا دەڕوا كه دژ بەيەك بوونو بەرامبەری کردنی ئەم چینه رەنگیانەیەو جیاوازی‌یه لەنێوان ئاوازه کاڵو تۆخەکاندا لەگەڵ دەستنیشان کردنی سنوریدا که مەودای تەسکی هەردوو رەنگەکه ئەگرێتەوەو وزەکانی بەرزدەکاتەوه بەرەو بەرزی‌یەك چەند بتوانرێ» ، ئەویش که دوورکەوتنەوەیه لەنێوان پەیوەندی تەواوی رەنگو واتادا (معنی) لێرەدا بۆ نیشانەی رەنگەکان بەکارهێنانێکی چەسپاو نیه . . ئەم کارەش بەهۆی کەمتەرخەمی‌کردن له پێنوسی خەڵوزی‌و پێنوسی وشك‌و رۆنی رەش‌و سپی‌دا) به وردەکاری‌یەك که هونەرمەند وا دەرئەخات دەستێکی باڵای له دەربڕیندا لەم کەرەسانەدا هەیەو توانای دروستکردنی هاوسەنگی نێوان مەبەست‌و دروستبووەکانی به چڕەو به دەنگی بەرزو هاوار هەیه که کاری دەروونی‌و بیری خۆی لەو کەسەدا ئەکات که ئەیبینێ .

له شێوازدا : له دوو پیشانگاکەی دوایی‌دا هەر له یەکەم کاتەوه تابلۆکەی هەروەك (کالاونمورفوزه– Anamorphosen) دەرئەکەوێ ، واته وێنەیەکی هونەری شێوێنراو که دیاره به رەنگ‌و پەڵه رەنگ تێکەڵاوه . بێ‌ئەوەی پەیوەندی‌یەکیان پێکەوه یان لێك نیزیك‌بوونەوەیەکی کاری‌گەری به هەستکردنەوه هەبێ‌و سەرنجدەر پێویسته به وردی سەرنجی

بداتێ بۆ لێك جیاكردنەوەیان بۆ ئەوەی لە نهێنیەكەی تێبگات ، لە پێشەوە وەكو دیمەنێكی سروشتی دەرناكەوێ‌و رووتئەبێتەوە وەك وێنەی ئافرەتێك یان وەكو قەشمەرجار یاخود بەپێچەوانەوە دەبینرێ . بەلام إ.خەیات إ ئەم بەرەو رووچوونەی بۆ مەسەبەستێكی ترەو بەلایەوە گونجاوە . . جا هەروەك هونەرمەندی سویسری (پۆكلی – ١٨٧٩–١٩٤٠) ئەڵێ «هەموو شتێك كە تێپەری خێرا لەناونا چیێ تەنیا بەندوو چیرۆكی بەمانا نەبێت» «هەموو ئەوانەی دەیانبینین تەنیا بانگ‌هێشتن نەبێ هیچ نین رەنگە فێڵیش بن بەلام رەسەنە راستی‌یەكە لە ناخدا خۆی شاردۆتەوەو نابینرێ .

لەسە ر ناوبردنی (پول كلی) دا دەتوانین بەتەواوی بیبرێنینەوە كە لێرەدا زیاتر لە پەیوەندی‌یەك هەیە لەنێوان جیهانی بەرگ‌دروو جیهانی (پول)دا ، بەگشتی هەست‌دەكەین كە هیچ سنوورێك نیە لە میانەی رووت‌كردنەوەو رووت نەكردنەوەو بچوكی بەشی زۆری تابلۆكان لە چنگی بیری هوشیار رزگاربوون‌و بۆی دەرچوون‌و بەرەڵلاكردنێكی بەناوكەوتووی بێ هوشیارانەیە بۆ روخاندنی بیری كورت ئەمەش بە تێكەلاوكردنی هوشیاری بەبێ هوشیاری لە پێكهێنانی رەنگە رەمزی‌و داماڵراوە محكەمەكەیدا كە بەتەواوی پرۆگرامی بۆ دانراوە . لێرەدا ئەندێشەی كێوی خۆی كە پرن لە ژیان بەسە بۆ ریسواكردنی زە لكاوی ئوە دۆخانەی كە هونەرەكە بێی راهاتووە ، بەلام رەقترین پەیوەندی كە هەیە لەسەر دروست‌كراوە كە توانای هێڵ كێشانە– ئەمەش بەئاسانی سەرەتایی‌یە هەروەك ئەو هێڵ كێشانەی كە (كلی) بەكاری ئەهێناو شێوەكەشی لە (هێرۆغلۆفی) دەچوو .

(إ.خەیات) ئەگەر سەرنجی پلە تەكنیكیەكەی بدەین ئەبینین كە بەرزترین پلەی هێڵی لا وەكو رەهایەكی دامەزرێنەرەو جوانی وایە جا ئەگەر هێلەكە رەنگدار بێ یان بێ‌رەنگ ، چونكە (إ.خەیات) تەقەلای داكوتانی رەگی هاوسەنگی ئەدات لەنێوان ئەندێشەو پێكهێناندا ئەمیش لەو دەربرینەدا كە هەندێك رێگای رووت‌كردنەوە دەگرێتەبەر . (پۆل كلی) ئەڵی ئەفسانەی منداڵێتی لە وێنەكانمدا وا دەرئەكەوێ كە لە دروستبووە هێڵی‌یەكانمدا سەریان هەڵداوە كە تیایا ویستومە وێنەی مادی وێنەی مرۆڤ بۆ نموونە بە ئەندامی هێڵی بێگەردەوە بەستمەوە .

ئەگەرچی ئەمویست مرۆڤ چۆنە هەر وای دەربرم ، بەلام ئەمە پێویستی بە بەكارهێنانی گیروگرفتی هێڵی ئاڵۆزە . بەمە وێنەی یەكەم ئەكەوێتە دووی دەرەوەی مەبەست‌و ئەنجامیش لە هەست‌كردندا تەمێك پەیدائەكات ، هەرچۆنێك بێ ئارەزووی ئەوەم نیە نیگاری مرۆڤ بكێشم كە وەكو هەیە ، بگرە وەكو پێویستە بێ .

ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ كە وەك پێویستی‌یەك لەنیوان واقع‌و ئەندێشەدا ئەبێ بەرامبەر ئەم كاتە بەجۆشانە راوەستی . هەروەها (إ.خەیات) وامان لێ دەكا كە رووبەرووی جیهانێكی سەرسورهێنەر بینەوە كە راستی‌یە ئەندازیاری‌یە بیناوەكانی هەمەچەشنەشت لە بەردەم كۆمەڵی ئەندێشەی سەركەشدا وردووخاش بین ، لە سەردەمێكدا كە گێرەشیوێنی بڵاوبووبووەو خراپە گەیشتبووە چەوساندنەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە كون‌و قوژبنی تەنیوە بەجۆرێك كە دەنكی حیكمەتی تیا نیە تا بە گەرمیەوە كەڵكی لێ وەربگرێ . . ئالێرەدا بوون (واقع) لەگەڵ نیشانە (رەمزدا) تێكەلاو ئەبێ بۆ دەربرینی ئەوەی لە خودی هونەرمەندا هەیەو لە دەروونیا قوڵپ‌ئەدات لەو شتانەدا كە پێیان ئەڵێن ناخۆشی كە تەنیا لادان‌و ئاوسان نەبێ لە هێڵ‌و رەنگەكاندا هیچی تری دەست‌ناكەوێ هەروەك (تەعبیریەكان) ئەم رێگەیەیان گرتبوو ، پێویستە ئەوە لەبیر نەچێت كە (تەعبیری) (Exprenionism) لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا دەركەوت‌و بڵاوبووەوە بەتایبەتی دووای شەری یەكەمی جیهان .

ئەمیش هات بە دەرخستنی رووەكانی دەرەوەی هەستی ناوخۆ بەست بە بەرەلاكردنی هەستە ناوخۆیی‌یە تەنگاوە لەدایك بووەكەی ئەنجامی پێویستیەكی زۆر زۆر بۆ بەتاڵ‌كردنەوەی كۆمەڵی هەست‌و هەڵچوون‌و كاریگەربوونی سایكۆلۆژی‌یە بەندكراوەكەی دەستی لادان‌و ئاوسان لە هێڵ‌و رەنگەكاندا .

لەو كاتەدا كەوا ئاژاوەو دوودڵی هەیەو ئارام كەم دەست‌ئەكەوێ ئالێرەدا بەتایبەتی خۆمان بەرامبەر تازە ئەندێشە ئەبینینەوە كە هەموو كات بەتەنیا رەگی شێوازێكی خۆی داكوتاوە كە دوورە لە زۆرانبازی‌و هەڵكەندنە هونەری‌یەكان كە ئەندیشەكەی بە روناكی‌و خەستی دادەنێ كە ئەمیش هەر ناورەرۆكێكی وجوودی درێژەی پێ داوەو لە هەردوو رووەكەیدا خواستی زەوی مرۆڤ لە مەبەستە دڵسۆزانەكەیدا سۆزی خۆی نەخشاندووە .

ئەگەر لە تابلۆكانی إ.خەیات زۆر وردبینەوە ئەوەمان بۆ دوویات‌دەبێتەوە كە هەندێ جار لە شێوازی (باروكی) نزیك بۆتەوە كە ئەندامە نەخش‌و نیگاری‌یەكانی رزگاردەكات .

ـیەتی بەشە ئەندازیاریو رووەکی‌یەکەی ، لەو رژێمە کە ـەستی بە زۆربوونو زاڵبوون بەسەر ئەندامە ـرووست‌کەرەکاندا کردووە هەروەها دوایی وردبوونەوە ـەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە چۆن شێوە بەلای (إ.خەیات)ەوە ـەت لە داتاشینەکانی‌دا وایە لە وێنەش‌دا لە رەنگ زیاتر خۆی ـەسەریا سەپاندووە .

ـەگەڵ ئەوەی کە ئەبێ دڵنیایی لەوەدا هەبێ کە ـلاوبوونەوەی ئەندامە نەخش‌و نیگاری‌یەکان شان‌بەشانی ـەمە دروست‌کەرەکان بەلای (إ.خەیات)ەوە لە رێ ـبەستندان بێ‌بەش نین ئەمەش لەوەوەیە ئەو کونو خالانەی کە ـە دەموچاوەکەدا هەن تەمێك وەك تەمی کونو ئەشکەوت ـروست‌ئەکات . . دیسانەوە شێوە بازنەیی‌یەکان بە پیتو پێز ـدەرئەبڕێ‌و ئەم شێوە چەماوانەو خرۆکیانە بەرگی نەرمی‌و ـهێزی‌و بێ‌دەنگی‌و بەخشینی‌یان پۆشیوە لەگەڵ ئەم ـدروست‌کراوە دەست‌کرادانەی کە جۆرێك لە ساکاری‌و ـنوێی وا پیشان‌ئەدات کە هێڵەکانیان ئەو جۆگانەن ئەچنە ـدەریای ئەو زەمانە تەشکیلیە رووناکەوە کە بە نرخی بیرو جوانی ـدەخراوەو دەربڕی مەبەستەکانی دروونی ئادەمیزادە .

لە رووەکاندا رەگی دەنگدانەوەی خورەی زەوی‌یە بە هەموو پارچەیەکی ناخۆش‌و مەبەستەکانی‌یەوە .

لەنێوان خاك‌و رووەدا : زەوی : گۆشەی بینین : روو : گۆشەی بینین پارچەیەك لە (بانوراما) ، روو : پارچەیەکی ـرێکی گەورەیە بە چوونەناو یەکەوە رووناکی تیلکرسکوبی واتە (مکرسکوب‌و تەلەسکوب) بەریا دەبێ خاك ئەبێتە روو ، روو ئەبێتە خاك ، لەخاك‌داروو دەبینین‌و لە رووداخاك دەبینین خاك : مێژووی خۆی هەیە ، رووش مێژووی خۆی هەیەو هەردوو مێژووەکەش تێکەڵاو بوونەتەوەو خاك مرۆڤاوی‌و مرۆڤ خاکاوی دەبێ ، زەوی بە لێدان ئەمێنێتەوەو رووش ئەبێتە گۆرانی موسیقا .

بەتێکرای رووی مرۆڤایەتی زیاتر لە ئەندامەکانی لەش بەرێگەی لۆچەکاندا توانای زیاتری هەیە بۆ دەربڕینی هەڵچوونە جۆربەجۆرەکانی مرۆڤ کە ئەمە لە رووە ساختەکاندا دەرناکەوێ . . لای (إ.خەیات) کارێکی قووڵ لە سێبەرو روناکیدا هەست‌پێ‌ئەکەین بۆ خشت‌کردنی هەڵچوونەکان کە لە ئازایەتی هێڵە دزوست‌بووەکاندا بە قووڵی‌و زیندوویەتی ئەتەقێنەوەو ئاڵۆزی گەورە ئەبێ‌و ئەچێتە ئەو رووە راهاتووەی کە بە قووڵی‌یەوە هەموو مرۆڤایەتی دەرئەخا کە لایەنگیری تەواوی بۆ زەوی وەك رووەکان کە بەخشینێکی مێژووی بیزاوی هەیە لە رێگەی بوونی مرۆڤایەتی بەگشتی‌و بە چاوێکی وردی‌یەوە دووپات‌ئەکاتەوە . ئەمەش بەشێوەیەك لە شێوەکان لە رووەکانی هونەرمەند (رامبرانت) . . ئەو دەموچاوانەی دووژمنی تالانی‌و دەست‌درێژین .

ئەوەی شایانی باسە (إ.خەیات)لەم رێگەیەدا ئەگات بە هونەرمەندی سوریایی مەروان قەصاب باشی (١٩٣٤-    ) کە ئەڵێ : رووی ئادەمیزاد رایگرتم‌و رایکێشام ، رەنگە هیچ هونەرمەندێکی تری وەکو من لەمەو پێش بەم شێوەیە رانەگیراوەو وێنەکێشانی رووی مرۆڤیش وەنەبێ شتێکی نوێ بێ ، کەچی وێنەی خەڵکیش ناکێشم‌و بەلامەوە (روو) ش بەشێك نیە لە (تابلۆ) بگرە سەرنجی (روو) بە ساکاری‌یەوە ئەدەم . . بە ئاسایی . . رەنگە دووبارە بە هەستێکی مندالانەش بێ‌و هەموو جارێك بەرەورووی بەرگەگرتنی کەرەسە هونەری‌یەکە ئەبمەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا کە ٢ ساڵ تاقی‌کردنەوەم هەیە وا هەست‌ئەکەم تا ژیان بمێنێ چیرۆکیش هەر ژیاوە . بەلام ئەوەی کە جیاوازی بایەخدار بخاتە نێوانیانەوە ئەوەیە کە (قەصاب باشی) هونەرمەند هەموو توانای خۆی لەو رەنگەدا بەکارئەهێنێ کە دەورێکی سەرەکی‌و گەورەی هەیەو بەهۆیەوە هەناسە ئەدات ، ئەمەش لە کاتێکا کە رەنگ ئەخاتە کەنارێکەوەو لە سنوری دەربڕین (تعبیر)تێ ئەپەڕێ‌و لە لێواری داماڵین (تجرید) نزیك‌ئەبێتەوە .

(«إ.خەیاتی») هونەرمەند بەشوێن مرۆڤ‌و جیهاندا بەیەکەوە ئەگەرێ کە (روو) لێك‌ئەکاتەوەو لەگەڵ زەویدا بەجۆرێك ئەیانکات بەیەك کە کۆتایی‌یە پێویستی‌یەکان لەم رێ‌رەوەدا دەتەقێنەوە .

لێرەدا لە چوونەناوەوەی یەکتری (روو)و (زەوی)یەوە ، واقیع لەگەڵ نیشانەدا تێکەڵاو ئەبێ بە هەست‌پێ‌کردنی خواستەکان‌و درکانی نیاز ، یەکێتی ئەندامی نێوان خودوو مەسەلە کە بەشێوەی سووربوون لەسەر داماڵین بەهێزدەبێ کە قوول‌بوونەوەیەك لەو ئەتروحەیەدا درووست ئەکات کە چواردەوری ئەنیوەو دەوڵەمەندەو ئەیەوێ لەم رێیەوە دیالێکتی جیهانی ناوخۆو دەرەوە بێ هیچ سنوورێك رەنگ پێ بداتەوە ، لەگەڵ ئەوەدا کە (إ.خەیات) زۆر جار کە هارمۆنی رووی مرۆڤ بەکارئەهێنی کەوا هاتووچۆی زۆر تیاکەلەکەبووە بۆنەوەی لەو رێ‌یەوە هەموو مرۆڤ خۆی‌و جیهان بکاتە دەست‌مایەو ناوەرۆکی هەمەجۆر تیا ئەخلیسکێ ئەمەش بە تەقینەوەی رووە

گرتووەوەکەی مرۆڤـو بوون لە یەکبوونی زەویو روودا .
رووەکان ئەتوانن واقیعی ناخۆشی مرۆڤی هاوجەرخ بدرکێنن لە رێگەی گرژبوونی هێڵو لۆچەکانی رووەوە کە دەردی سەریو تالآوو نائومێدیو گێرەشێوێنی ناتوانیٚ بشارێتەوە ، هەروەها وەك زەوی دەور ئەبینیٚو بیٚدەنگ بە شوێنەواری دلٚرەقیو هەستی ئازاراویەوە ئەدرەوشێتەوە .
خۆ ئەگەر زیاتر چوینە ناو خوێندنەوەی رووەکانەوە ئەبینین وردووخاشو پارچەپارچە دەبنو پاكدەبنەوەو گرنگ دەدەنو خوێنیان لەبەر دەڕواتو بەرزدەبنەوەو دەبنە کەشێکی ئەفساناوی ئاڵوزی پڕ لە رازو نهێنی .
هونەرمەند کە نهێنیەکانی روو ئامادەئەکات ، مەودایی رووە ئەختەکە ئەبڕیٚو ئەچێتە ئەو شوێنەی کەوا خودی مرۆڤی تێدایەو گیانی شۆرشی کڵپەداری تێدایە دژی ئەو دلٚرەقیەی باری حاڵ کە لە رووبەرێکی فراوانی زەویدا لەسەر تالآنکردن وەستاوە .
-ماڵی مرۆڤ- ئەو روەوانەن کە لە مەودا بڕیندا لە مەودای ئاسای تێدەپەریٚو هەنگاو بەرەو پلەی چاولێکردن ئەنێن کە دەست پێوەگرتنی مەودا لە رووەکەی بزردەکاتو لە هەموو مەودایەکی هەستی رزگاری دەبیٚ بۆ ئەوەی بتوانی بچێتە ناو قولآیی ئەو شتانەوە کە لە پشتیانەوە هەن . هەروەها هەندێك رووش هەن کە لە چەند پارچەیەکی کەڵەکەکراو زیاترن خۆ ئەگەر زیاتر لێیان وردبینەوە لێ رووبار ، چرچو لۆچیان زۆر بۆ دەرئەکەویٚ هەروەك لە نەخشەو قیمەکێشدا هەن . یاخود ناوچەوان خۆی لێیدراوە .
بەلآم برۆکان هەندێك جار پڕنو یاخود نین یان لە رووەك یان گریٚ دەچن .
چاو . . چی لە چاو دەزانی کەوانی (هلالی)و دەرپەڕیو . . یان نیە . درەوشەدار ، سیٚگۆشەی ، چوار گۆشەی ، بازنی ، لاکێشەی . دروستبووەکانی رووەك ، سەرچاوەی پرشنگ ، لولەییو باوەشێنی ، هیلانە جاڵجالۆکەیی ، پەرەگوڵە بەرۆژەی ، داپۆشراوە ، چاڵی رەش ، بە زنجیر داخراوە . . .هتد . هەروەها چاو هەموو کات لە یەکتر ناچن .
روومەتەکان زۆر جار خوراونو لەکەدارن یان پەڵەی رەشیان پێوەیە . یاخود بە پەڵەی هەوریو دووکەڵی داپۆشراون . یان بەو برینانەی کە هێشتا تەقەڵی درووومانیان پێوەیە .
لووتیش خۆ ئەوە یان خوێنی بەربووە یان خواراوە یان خوارەیان تلٚیش‌تلٚیشو دراوە لێوەکان هەویانکردووە یاخود خوارن یان تلٚیش‌تلٚیش‌بوونٚ یان دراون .
ریش گەلیٚ جار شێوەی رووەکی وەردەگریٚ .
دەم خوارە ، یان تێکچووە یان گریٚدراوە یاخود بە تەلی درکاوی هەلٚپچراوە یاخود بریتیە لە نیشانەی پرسیارێك یان داخراوە . . !
بەگشتی لەسەر روو پێکهاتووی هێلشویو شێوەی مەخروطی بلآوبوونەتەوە ئەمە بێجگە لە بازنەیو سیٚو چوار گۆشەی . . هەروەك چۆن هێڵە راستەکان بەزۆری رووەکان بە ئاسۆییو بە بەرز لە یەك کاتدا دەبڕن یان بەرامبەر ، وەك شیش کە روو دائەپۆشن .
ئەوەی کە مرۆڤ رادەگریٚو وای لیٚ دەکا لە روو پرسیار بکات قەوارەی ئەو تابلۆیەیە کە لە قەوارەی پۆستکارتێکی ئەم دەستـو ئەو دەست پیٚکراو تێپەر نابیٚ . رووەکان کارتی هونەرمەندەکەیە بۆ جیهانێك کە پڕە لە ئەشکەنجەی ئادەمیزاد بەجۆرێك شنەی بای کوردستان رائەپەرێنیٚو ئەیئاخنێتە ئەو رووانە وەکو جولآنەوەی هێلٚ ئەئالێتە شاخە بەرزو نشێوو دۆڵە فراوانو کونو ئەشکەوتە تەلیسماوییە تاریكو رووبارە پێچ‌خواردووەکانی کە لە بەرزاییە رووتەکانەوە بەرەو دەشتاییەکان شۆڕدەبێتەوە کە روناکترین نیشانەی رەسەنایەتی هونەرمەندن لە دەربڕینیا سەبارەت زەوی مرۆڤ لە پۆیەی یەکخستنی خودو باسەکەدا کە زەوی لە خۆیەوەو بەزۆر هەروەها قەوارەی تابلۆکە بەروو بەیەك ناگەن .
لێرەدا ورياکردنەوە پێویستە کە ئەویش تەواو دلٚنیا بوونە لەوەی کە مانەوەی هونەرمەند لەناو پۆلگەی (شرنقە) ئەم شێوازەدا لە سەر بەستیو ئاسۆیدا گۆڕانێك ئەدۆزێتەوە . .
بەتایبەتی هەڵوێستی بەرامبەر رەنگ کە بۆچی هەر لەسەر ئەو رەنگدانە ئەڕوات . . بلٚیٚ رەنگەکان بەشێك بن لەو کۆسپانەی دێنە ریٚی دەربڕینی کەژە ئەشکەنجەدارەکەی جیهانەکەی ؟ بۆچی نایەت رووبکاتە مەودای تەواوی ئەو جیهانەی رەنگەوە کە سنووری نیە ؟ گومانی تێدا نیە ئەو مەودا فراوانەی رەنگەکان لە پێکهێنانو دەربڕیندا هەروەك چۆن ژمارەی جۆرەکانی کاریگەرییە سایکۆلوجییەکان لە پلەکانی رەنگدا بە پیت دەکات هونەرەکەشی دەوڵەمەند دەکات کە ئەمانە هەموو توانایەکی گەورەتر بە هونەرەکە دەدات لەگەلٚ ئەو کاریگەرییە بەتوانایەدا کە تێکشکاندنی بە رەنگی رەش رازاندنەوەیە .
سەرنج دەربارەی هێڵکاری :

نه ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی تر هۆنراوە یاخود چیرۆك ـەکەونە نامەخانە کوردی‌یەکانەوە کە هونەرمەند (بەرگدروو) ـەگی بەرگەکانیان ئەرێژی‌و هێڵی ئەوتۆی لەسەر دارشتوون کە خوێندەوار بۆ خۆیان رائەکێشن‌و چێژێکی نوێ ئەنێنە سەر مەسەلەی خوێندنەوەو ئەنجامی ژیان لەگەڵ ئەم نەخشانەدا ئەم سەرنجانە هاتنەکایەوە.

ئایا دەوری نەخشەکێشان بەرامبەر بە جوانبوون‌و نەخش‌و ـگەر کەم‌تەرخەمە وەك ئەو کەم‌تەرخەمیەی کە (المنمنمات) ـەوەبەر هەیبوو؟ ئایا نەخشەکێشان دەورێکی تەواوکەری ـەرهەمە وێژەی‌یەکەیە؟ نەخشەکێشان دەوری شی‌کردنەوەی هەیە؟ ئایا دەوری هاوشان ی هەیە، لەگەڵ بەرهەمە ـوێژەیی‌کەدا پەیوەندی بەیەکەوە بەستراویان هەیە؟ ـەرهەمەکەی هەندێ جار سەرووی بەرهەمە وێژەی‌یەکە خۆی نەکەوێ؟

وائەزانم کە وەڵامدا نەوەی گشت‌ئەم پرسیارانە (بەڵێ) یە ـرۆژی جا هەروەك پرۆژەیەك بۆ وەڵامێکی کراوە ئەڵێم ـەخشەکانی (خەیاتێ) ی هونەرمەند کە لە کۆمەڵە هۆنراوەو چیرۆکێکدا بلاوبوونەتەوە ناوەڕۆکی ئەو بەرهەمە وێژەییانە ـەشێوەی دەمەتەقێ لەرووی جوانیەوە رەنگ پێ دەداتەوە ـەگەڵ ئەو جیاوازی‌یەش‌دا کە لە باسەکان‌و تاکەکان لە تاکە هۆنراوە یان چیرۆکدا گەلێ جار هەن. بەڵام لە ئەنجام‌دا لەگەڵ ـوەڕوکی بەرهەمە وێژی‌یەکدا واتە (نیازەکەی) یەك‌دەگرێتەوە ـێنەوەی لە گەرمەی وێنە وێژەی‌یەکەیدا بزربزر بێت.

نەخشەکانی (ا.خەیات) جیهانێکی هۆنراوەیی‌و لە خودی‌یەوە سەری هەڵداوەو لە سەردەمێکی تەنك‌و شێواودا ئەندێشەی هەمەلایە تیا کۆبوونەتەوە، کە دەمی دەگمەن لە تێکەڵبون واقیع بە ناواقیع‌و پەسەندو ناپەسەندبووندا هەڵقولاوە، سەربەستی‌یەك روو دەدات‌و ئەوانەی کە هەن ئەو ـێنە ئاسای‌یانەیان کەم‌دەبێتەوە کە هەیانەو کاری بینراوی تەقلیدی کۆتای دێ‌و نەخشەکان لە راکێشەری واقیع‌و گرانی تا ئەو سنوورە رزگاری دەبێت کە ئەندێشەی هونەرمەند تیایدا وەکو ئەفسانە ئەنوێنێ.

نەخشەکان رەسەنایەتی‌و یەك‌لای لەو شێوازەدا کە ناسکی هێڵ‌و دینامێتیەت‌و بە چێژی گۆرانی‌یە سەرکەش‌و سەرەتای‌یەکان دەردەخەن. بەگشتی بەلای داماڵین‌دا ناچێت، دوایش چابووکی لە بوونی بێ‌گەردی نەخشەکیشان‌دا وەك هۆیەکی دەربڕین نیشان‌دەدا لەم ڕێیەوە هونەرمەند ئەچێتە ژێر توێکلی واقیعەوەو تێکی ئەشکێنێ‌و سەرلەنوێ دژی ئەو واقیعە دروستی‌دەکاتەوە کە پڕیەتی لە تالانکردن.. کە ئەبێتە هۆی پرس سەبارەت لە گومان‌کردن لە راستی ئەو دۆخەی کە هەبووان هاتۆتە کایەوەو باوەڕی ساختە بەوەی کە هەیەو ئەو باوەڕ پێ‌کراوە. لە جێ خۆ راوەستاوە لەق‌ئەکات بەم جۆرە خەیات ) ئەتوانێ هەستێکی قوڵ بە غەریبایەتی مرۆڤ هاوچەرخ بە هەموو تێکدانێکیوو ناخۆش‌و سەرکەوتن‌و سوربوونێکیوە رەنگ پێ بداتەوەو ئەندیشەکانی لە نهێنەکانی خودی مرۆڤایەتیەوە هەڵدەقوڵێ کە لێوان لە نیشانەی تەنك‌و جا ئەگەر چەند ئەو لەشەی مرۆڤ ئەستور یان لاواز یان کەتە یاخود چڵ‌و چێوبێ، یان ئەو ڕووە هیچی دیار نەبێ تێك چووبێ یاخود چاوەکان دەرپەڕیوبن یان چاویان یاخود بێ چاو بن..

ئەمە هەندێ جار بەلای پەلەوەرو درەختیشەوە ئەبێت، ئەمەش مەودایەکە کە لە چەند ماڵێك گەورەترە.. ئەمانە هەموو دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کە هونەرمەند هەستێکی ناسك‌و زیادی هەیە بەرامبەر ئەو شتانەی بوون ئەیانبەخشێ باسەکان‌و تاکەکان لەتاکە هۆنراوەیان چیرۆکدا گەلێ جار هەن بەڵام لە ئەنجام‌دا لەگەڵ ناوەڕۆکی بەرهەمە وێژەی‌یەکدایەك دەگرنەوە.

بەڵام ئەوەی کە زوبانی هونەرمەندی تەشکیلی گران‌دەکات‌و لە قوڵای‌و فراوانی‌و لەخۆوە جوڵانی لێدان‌و چاوێلکەو هەرەتیەوە ئەمژێ. شێوەیەکی کەڵەکەکراوی هەندێ نەخشەیە: چونکە پارچە بێ دابین‌کردن هیچ نانوێنێ‌و لەخۆیەوە بە بۆشی‌و قوڵی دەمێنێتەوە بەتایبەتی کە ئەچێتە ئەو پەڕی بۆشای پەڕەوە ئایا ئەم نەخشانە ئەگەنە ئەو سنوورەی بە جیهانی دەرەوە تێکەڵ ببن‌و مەودای ئەم پەرەیە ئەشکێنێ یاخود؟

زیاد رۆشتن لە هێڵ‌و شێوە ئەندازیاری‌یە زەقەکاندا بە هێڵە راست‌و یەك‌بڕەکان‌و تێکشکاوەکاندا...هتد ئەم کاژە تێکەڵەی ئاژاوەو وردەکاری بەڵام سەرەڕای تەمام کردنی بابەتەکەی‌و لە سێبەرا نوقم‌کردنی یەك‌گرتنی ئەم هۆیانە هەمووی لاوازی‌و کرچ‌و کاڵی دەخەنە هەندێ بەرهەمی‌یەوە.

**لە گۆڤاری (الثقافة)**
**ژمارە (٤) سالی**
**١٩٨٠– وەرگێڕاوە**

**لەم باسەدا هەر بە دوو پیشانگاکەی دوای بایەخ دەدرێ**

# تەنگوچەڵەمەی قەرزو ـ مەسەلەکانی تر ـ

مولود حمە نبي     وەری گێڕاوە

**أ  مەسەلەکە بە کورتی :**

تێکڕا ئەو قەرزانەی کە لەسەر دەوڵەتانی تازەپێگەیشتووەو جارێ نەدراونەتەوە ، لەم ساڵانەی دوایدا زۆر بەرزبووەتەوە. لە ساڵی (١٩٧٠) وە تا ساڵی (١٩٧٣) لە (٧٥) حەفتاو پێنج بلیۆن دۆلارەوە گەشتۆتە ٣٢٠ بلیۆن دۆلار ، وە واش دانراوە کەوا لە ساڵی (١٩٧٩) وە گەشتۆتە ٣٦٦ بلیۆن دۆلار. هەرچەندە کە کەس گومان لە زۆری قەرز ناکات ، بەڵام تەنگوچەلەمەی قەرز لە ناساندنی دا لە جۆرەها روانگەو بەپێی بۆچوونی شیکەرەوەکە خۆی ، سەیر دەکرێت.

رای زۆربەی نوێنەرانی ولاتانی دەوڵەمەندو دەرامەتدار وایە کەوا تەگەرەکە بۆ ئەو ولاتە تازەپێگەیشتووە دەگەڕێتەوە کە تا چ رادەیەك دەتوانێ بەرامبەر بە قەرزەکانی بەوەفا بێت.

ئەم تەگەرەش دڵەخورپەو نارەحەتی زیاتر بۆ خاوەن بانقەکان پەیدا دەکات لەوەی کەوا بۆ دەوڵەتانی هەژارو بێپارە پەیدا دەکات.

لە لایەکی ترەوە ، کۆنگرەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ بازرگانیو پەرەپێدان (الاونکتاد) وا دەبینێ کەوا (تەنگوچەلەمەی قەرزە) ، لەو کاتەی کەوا رادەیەکی بەرز لە بەشەکانی قەرزدانەوە (هی قازانجیش لەگەڵی دا) بەشێکی زۆر لە ئیراداتی دەوڵەتانی جیهانی سێیەم ، کە بۆ پەرەپێدان پێویستی پێ هەیە ، لەکار دەبرێ. وە وا دیار دەکەوێ کەوا کارگێڕانی بانقەکان باوەڕیان وایە کە ئەم قەرزانە لە بنەڕەتدا بۆ نارێکیی هەڵسوڕانی کاروباری ئابووری‌یەوە دەگەڕێتەوە. وە گەلی جار ئەو قەرزانەی کە دەیدەن ، بەشێوەی ئابووری‌یەوە دەبەستنەوە کە مەبەست یاریدەدانی دەوڵەتانی تازەپێگەیشتووە بۆ رێکخستنو بەڕێوەبردنی قەرزەکانیان. وە سەرۆکانی دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو سوورن لەسەر ئەوەوە کەوا ئەو تەگەرانەی بووەتە هۆی زۆر قەرزکردن لە لایەن ئەم دەوڵەتانەوە نی‌یە. وە هەستیش بە نارەحەتی دەکەن دەربارەی ئەو هەڵس‌وکەوتانەی بانقەکان دەیکەن کە لە راستی‌دا زیاتر تەگەرە بۆ هەندێ

دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو دەهێننەکایەوە ، بەم جۆرەش هەر ئەبێ بە گۆڕێ بێ ، وەسیمای نیشتمانیی لە ئابووری ئەم دەوڵەتانە تا ـ دەیەکی ناپەسند دەمرێنێتەوە . هۆی ئەم نارەحەتی‌یەو زۆری تر ـوەوە داواکردنی چارەسەر کردنی رژێمی دراوی دەوڵەتانو ـدکردنی دەرامەتی راستەقینە کەوا بۆ جیهانی تازەپێگەیشتوو گوێزراوەتەوە .

**ب – رژێمی نوێی ئابووری دەوڵەتان :**

لێکۆڵینەوەیەك کە ، بەشی راگەیاندن لە بەرنامەکانی پەرەپێگەیاندن لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا ئامادەی کردووە . . ـ نیاری بنجیی لەم بارەوە تێدایەو ئەو دۆخو بیرو بۆچوونانەی ـەندن بە دامەزراندنی پەیرەوێکی نوێی ئابووری دەوڵەتان چاك روون دەکاتەوە . لێکۆڵینەوەکە باس لە تەنگوچەڵەمەی قەرزەوە دەکات . . کەوا حەوتەمین خولی بەروەختی سەر بە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بەم چەشنەوە پەنجەی بۆ درێژکردووە : «سەختو گرانیی قەرز بەسەر دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو بە جۆرێك لە بر دایە کە کار دەکاتە سەر توانای شت‌هێنان لە دەرەوە . . وە ئەبێ دەرفەتی چاك بۆ دەوڵەتانی تازە پێگەیشتوو باو بکرێت بۆ ئەوەی بگەنە بازێرەکانی سەرمایەدارییی لە ولاتانی فرە پێشکەوتوودا» هەروەها « . . دانانی پێوەندی لە نێوان مافەکانی کێشانەوەی تایبەتو بارمەتدانی پێگەیاندن ئەبێ بەشێك لە لێکۆڵینەوەکانی سنووق دراوی دەوڵەتانەوە پێك بهێنێت بۆ دامەزراندنی مافەکانی نوێی کێشانەوەی تایبەت . . » .

**ج – زانیاریی سەرەکی :**

«سەرۆکی دەوڵەتان یا حکومەتەکان لە بارو دۆخی دراوی دەوڵەتانەوە کۆڵیونەتەوەو نارەحەتی خۆیان بەرامبەر بەوە خستووەتەوە کەوا پەیرەوی ئێستای دراوی دەوڵەتان نەك تەنیا پێداویستی‌یەکانی پەرەپێدان لە دەوڵەتانی بێ‌لایەنو دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو بەجێ ناگەیەنێتو بەس ، بەڵکو تێکچوونو کزبوونی باری ئابوورییان بەشێوەیێکی بەردەوام بەتین‌تر دەکات» .

«بە تێزیش دووپاتی ئەوەیان کردووە کەوا باری دراوی دەوڵەتان دەبێتە هۆی رانەگرتنی نرخی سەرف‌کردنو هەڵئاوسانی گشتی . هەروەها ، دەوڵەتانی فرەپێشکەوتوو ، کە باری بە رژێمی دراو دەکەن ، زیاتر جلەو بەدەست دەبن لە جۆرەها بڕیاردان لەم رووەوە کە بە شێوەیەکی گشتی‌یەوە هیچ گوێ بۆ پێویستی‌یەکانی دەوڵەتانی تازەپێگەیشتووەوە شل ناکەن .

١ – نایەکسانی رژێمی دراوی دەوڵەتان :

ئەو تەگەرانەی دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو تووشی دێن ئەوەیە کەوا یا دراوەکەیان بە بێ‌نرخی دادەنرێت ، یانیش بۆ مەبەستی بازرگانی دەوڵەتانەوە پەسند ناکرێ ، زۆر جاریش لەسەر دەوڵەتانی جیهانی سێیەم پێویستە کە نرخی شتومەك کە لە دەرەوە دێنن بە دراوی «گران»ەوە لە دەوڵەتانی پیشەسازی رۆژئاوایی‌دا بکرن .

– (بێگومان ئەمەش یان ئەبێ هەڵسن و دەست بە قەرزکردن بکەن یانیش ئەبێ دراوی «گران» بە نرخی ناردنەدەرەوەکانیان پەیدا بکەن بۆ ئەوەی بتوانن بەم کارەوە هەڵسن» . ئەم زیانەش لە سەرەتای حەفتاکانا وا لە زێدەبوون دایە لەو کاتەی کە رژێمی «بریتون وورس»ی دراوی دەوڵەتان رووخا ، کە دراوی «گران» ی یە نرخی پێوەنگی زێڕ ەوە دەبەستەوە .

«سنووق دراوی دەوڵەتان هەوڵی ئەوەی داوە کەوا پشت‌بەستن بە دۆلارەوە کەم بکاتەوە ، وە دراوێکی دەوڵەتیی هەمیشەیی بهێنێتە کایەوە . ئەوە بوو سنووقەکە «مافەکانی کێشانەوەی تایبەت»ی دامەزراند ، کە ئیعتمادانی کراوەی سنووقەو دەوڵەتان دەتوانن بە پێی مەرجەکانیەوە دراوی لێ وەربگرن .

دروبا غوبتا – لە وتارێکی‌دا کە لە بلاوکراوەی سنووق دراو «دراوو پەرەپێدان» ەوە بلاوکرایەوە ، مافەکانی کێشانەوەی تایبەت»ی بەم رێگەیەی خوارەوە داناوە :

«حیسابی کێشانەوەی تایبەت لە سنووق دراوی دەوڵەتانەوە لە ٢٨/ی تەمووزی ١٩٦٩ دامەزراوە . هەر لەو کاتەوە ، سنووق دەیەوێ شێوازێکی نوێ لە شێوازەکانی ئیحتیاتی دەوڵەتیی ئەو دەوڵەتانەی بەشداری تێدا دەکەن ، دابنێت . ئەو شێوازە نوێیەش بە «مافەکانی کێشانەوەی تایبەت» دەناسرێ»

«جا چونکە ئیعتمادات بە پێی رادەی هەبوونو بەشەکانیەوە لە سنووق دراوی جیهانیەوە دادەنرێت . . . ئەوە بە گوێرەی ئەم مافانەوە ، بەشی زۆری ئەو پارەی کە دەردەهێنرێت هەمووی دەچێتە گیفانی دەوڵەتە پیشەسازی‌یە رۆژئاوایی‌یەکانەوە . بەوێنە ، لە ماوەی نێوان ١٩٦٨ – ١٩٧٤ رادەی ٧٢٪ لە مافەکانی کێشانەوەی تایبەت بۆ هەر بیست‌و حەوت دەوڵەتان کە لە گشت دەوڵەتانی ترەوە دەوڵەمەند ترن دانراوە . . لە کاتێکا بەشی دەوڵەتانی جیهانی سێیەم کە ئەندامن

لە سنووقەکەو ژمارەیان ٩٩ دەوڵەتە تەنیا ٢٨٪ی ئەم مافانەیان بۆ تەرخان کرابوو .

**پەیوەندی مافەکانی کێشانەوەی تایبەت بە پەرەپێدانەوە :**

ولاّتانی تازەپێگەیشتوو وا پێشنیار دەکەن کەوا مافەکانی کێشانەوەی تایبەت ، لە پێناو بوژاندنەوەی باری ئابووری‌یانەوە بە پەرەپێدانەوە ببەسترێتەوە .

جا لە جیاتی ئەوەی مافەکانی کێشانەوەی تایبەت بە گوێرەی بەشەکانیان لە سنووقی دراوی دەوڵەتانەوە دابەش بکرێت هەروەك ئێستاکە وایە ، ئەبیٚ رادەیەکی زۆرتر لە مافەکانی کێشانەوە بۆ دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو تەرخان بکرێت بۆ ئەوەی بتوانن دەستکورتی‌یی ئابووری خۆیان پیٚ چارەسەر بکەن . هەروەها چاکتر وایە کەوا هەڵس‌وکەوتی باشتر لەگەڵ دەوڵەتانی جیهانی سێیەم بکرێت دەربارەی زۆری دراویی بەکارهێنراو بە رێگای دۆزینەوەی شێوازی بەکارتر لە لایەن مافەکانی کێشانەوەی تایبەتەوە . وە دۆزینەوەی ئەم جۆرە شێوازانەش هیچ کار ناکاتە سەر زیان بە دەرامەت گەیاندن ، (وەك دەرهێنانی زێڕ لەژێر زەوی‌یەوە) .

بەڵکو دەرامەت زۆرتر دەکاتو زیاتر ئابووری دەگەشێنێتەوە .

**٢ - کۆبوونەوەی قەرز لە چوار ساڵاندا :**

دیسانەوە ، دۆخی تێکچووی رادەی ئاڵوگۆری بازرگانی بووە هۆی نەهێشتنی باری زۆر بەکارهێنانی دراو لە بازارەکانی جیهانی تازەپێگەیشتوودا . بازرگانی کەل‌وپەلی سەرەکی بۆ دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو ، کۆمەڵیٚ تەگەرەی هێنایە گۆریٚ . . لەمانە بەرزبوونەوەو نزمبوونەوەی نرخ . . هەروەها ئەو شێوازانەی دەوڵەتانی باکوور گرتوویانەتە بەر زیانێکی زۆری گەیاندە ناردنەدەرەوەکانی ولاّتانی تازە پێگەیشتوو . . وە هەڵئاوسان لە ولاتانی رۆژئاوادا بووە هۆی زیادبوونی نرخی ئەو شتوومەکەی کە جیهانی سیٚیەم وەری دەگرێت .

هەروەها بەرزبوونەوەی نرخی نەوت ، کە هۆیەکی تری سەرەکی‌یە ، لەگەڵ ئەو هۆیانەی کە ئێستا باسمان کردن ، کە بوونەتە هۆی زێدەبوونی قەرزی دەرەوەیی درێژخایەن بەسەر ولاّتانی تازەپێگەیشتوودا ئەوانەی کە نەوت بەرهەم ناکەن . بەم جۆرە تێکرایی قەرزەکان لە نێوان ٩٧٦ - ١٩٨٠ هەروەك لە خشتەی نمرە (١)ی خوارەوەدا دەبینرێت ، زیادی کرد :

**خشتەی نمرە «١»**
**«بە بلیۆنەها دۆلاری ئەمەریکی»**

| | ١٩٧٦ | ١٩٧٧ | ١٩٧٨ | ١٩٧٩ | ١٩٨٠ |
|---|---|---|---|---|---|
| **ئەو قەرزانە کە لەسەر ولاتانی تازەپێگەیشتووە لەوانەی کە نەوت بەرهەم ناکەن - و هێشتا نەدراوەتەوە :** | ١٣٩ر٠ | ١٧٢ر٠ | ٢١١ر٦ | ٢٤٦ر٤ | ٧٩ر٥ |
| **بە گوێرەی جۆری قەرزدەر :** | | | | | |
| **قەرزدەرە رەسمی‌یەکان** | ٨٠ر٩ | ٩٥ر٣ | ١١١ر٦ | ١٢٧ر٥ | ١٤٦ر٦ |
| **حکومەتەکان** | ٥٨ر٢ | ٦٥ر٩ | ٧٦ر٢ | ٨٦ر٢ | ٩٧ر٦ |
| **دەزگا دەوڵەتی‌یەکان** | ٢٢ر٧ | ٢٩ر٤ | ٣٥ر٤ | ٤١ر٣ | ٤٩ر٠ |
| **قەرزدەرەکان لە کەرتی تایبەتدا** | ٥٨ر١ | ٧٦ر٨ | ٩٩ر٩ | ١١٨ر٩ | ١٣٣ر٠ |
| **دەزگا دارایی‌یەکان** | ٤١ر٩ | ٥٧ر٥ | ٧٦ر٧ | ٩٤ر٠ | ١٠٦ر٢ |
| **قەرزدەرەکانی تری غەیری کەرتی تایبەت** | ١٦ر٣ | ١٩ر٣ | ٢٣ر١ | ٢٤ر٩ | ٢٦ر٨ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| بە گوێرەی کۆمەڵەی تەقلیدیی‌یەوە : | | | | | |
| ئەفریقیا | ٢٠ر٨ | ٢٧ر٤ | ٣٣ر١ | ٣٧ر٣ | ٤٣ر٣ |
| ئاسیا | ٣٨ر٦ | ٤٦ر٠ | ٥٣ر٩ | ٦٣ر٠ | ٧٢ر٣ |
| ئەورو | ١٢ر٦ | ١٤ر٤ | ١٨ر٨ | ٢٤ر٨ | ٢٨ر٨ |
| ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست | ١٤ر٩ | ١٩ر٠ | ٢٢ر٩ | ٢٦ر٨ | ٣٠ر٩ |
| نیوەی دنیای ڕۆژئاوا | ٥٢ر١ | ٦٥ر٢ | ٨٢ر٩ | ٩٤ر٥ | ١٠٤ر٢ |
| بە گوێرەی کۆمەڵەی تاکی‌ی شیکردنەوە : ولاتانی ناردنەدەرەوەی سەرەکی پیشەسازی | ٥٥ر٦ | ٦٧ر١ | ٨٢ر٤ | ٩٤ر٠ | ١٠٥ر٧ |
| ئەو ولاتانەی کە سەرپاکی ناردنەدەرەوەی نەوتیان لە سەرپاکی واریداتی نەوتیان زۆرترە | ٣٢ر٨ | ٤٣ر٨ | ٥٣ر٤ | ٦١ر٠ | ٧٨ر٠ |
| ئەو ولاتانەی کە دەرامەتیان نزمە | ٢٠ر١ | ٢٣ر٨ | ٢٨ر٠ | ٣١ر٨ | ٣٧ر٦ |
| ئەو ولاتانەی کە سەرپاکی واریداتی نەوتیان لە سەرپاکی ناردنەدەرەوەی نەوت کەمترە | ٣٠ر٥ | ٣٧ر٤ | ٤٧ر٧ | ٥٩ر٥ | ٦٨ر٣ |

**٣ – ئەو دەوڵەتە کامیانە کە لە گشتیان قەرزدار ترەو کامیانیش لە گشتیان قەرزدەرترە ؟**

أ – :

هەر لە ساڵی «١٩٧٤» ەوە ، تەنیا پێنج دەوڵەتی تازەپێگەیشتوو هەبوون کە قەرزداری کەرتی تایبەتی بوون . بەڵام ولاتانی قەرزداری‌ی سەرەکی ، لە ساڵی ١٩٧٩ دا هەروەك لە خشتەی نمرە (٢)ی خوارەوەدا دیارە وایە :

خشتەی نمرە (٢)

ئەو قەرزانەی کە نەدراونەتەوە لە بانقەکانی کۆمەڵەی دەیەم لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٩

«بە هەزارەها ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی»

| ولات | نرخ |
|---|---|
| بەرازیل | ٣٥ر٧ |
| مەکسیك | ٢٥ر٨ |
| فەنزەویلا | ١٦ر٦ |
| ئەرجەنتین | ١٠ر٦ |
| کۆریای خواروو | ٩ر٤ |
| جەزایر | ٨ر٣ |
| ئێران | ٧ر٧ |
| ئەندەنوسیا | ٥ر٨ |
| فلیپین | ٥ر٥ |

لە نەخشەکە دەردەکەوێ کەوا ئەمریکای لاتینی‌و کاریبی . لەم ساڵانەی دوایدا بەرزترین رادەیان لە قەرزدا وەرگرتووە . کەچی ئەو ولاتانەی کە ولاتی سەرەکی‌ی ناردنەدەرەوەی دروستکراوو پیشەسازیین ، سێ ئەوەندەی ئەو قەرزانەی کە دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو وەریان گرتووە ، دەبێت .

هەمان شتیش بەرامبەر بە خاوەن قەرز . لە نێوان ساڵانی ١٩٧١ – ١٩٧٣ ، (٦٠٧) شەش سەدو حەوت بانقی تایبەت هەبوون قەرزیان بە دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو دەدا . وە (٤٧٥) چوار سەدو حەفتاو پێنج بانق لێیان سەر بە دەوڵەتانی رێکخراوی هاوکاری‌و پەرەپێدان لە بواری ئابووری‌یەوە بوون . (خاوەن قەرزە سەرەکی‌یەکان ئەمانەن :

(١٣٧) بانقی ئەمەریکی (١٠٧) بانقی ئنگلیزی ، (٥٧) بانقی فەرەنسی ، وە (٣١) بانقی یابانی . لە کۆتای ساڵی ١٩٧٥ دا دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو بە رادەی دوو ئەوەندەکی قەرزەکانی ، قەرزاری بانقەکانی ولاتە یەکگرتووەکان بووە ، وە ٤٠٪ش قەرزاری شەش بانقی ئینگلیزی . . ئێستاکەش $\frac{3}{4}$ی قەرزەکانی بازرگانی کە لەسەر دەوڵەتانی تازەپێگەیشتووە ، بۆ (١٠) دە بانقە لە ولاتە یەکگرتووەکاندا .

**ب – بەرەو سەرچاوەی تایبەت چوون :**

سیمای سەرەکی قەرزەکانی ولاتانی تازەپێگەیشتوو لە ساڵانی ئەم دواییەدا ، ئەوەیە کەوا قەرزکردنی بازرگانی گرنگتر بووە لە قەرزکردن لە دەزگاکانی وەرگیراو لە سەرچاوە تایبەتیەکانەوە . لە

کۆتایی شەستەکانەوە لە ٢٠٪ی تێکرایی قەرزەکان بوو بە ٤٧٪ لە ساڵی ١٩٧٠ ، وە بۆ ٦٠٪ لە ساڵی ١٩٧٧ . کۆمەڵێ هۆ بوونەتە هۆی ئەوەی قەرزکردن لە سەرچاوە تایبەتیەکانەوە بێتە گۆڕێ . لەمانە زێدەبوونی پێداویستی‌یەکانی دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو . . وە سووربوونی بانقەکانی دەوڵەتانی رۆژئاوا بەرامبەر بە دۆزینەوەی کەلێن‌و بازاری نوێ لە جیهانی سێ‌یەم‌دا .

**جـ – قەرز بۆ قەرزدانەوە :**

زۆربوونی قەرزکردنی بازرگانێتی بووە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی قازانج بەسەر قەرزەکانی وڵاتانی تازەپێگەیشتوو . بە وێنە ، لە ساڵی ١٩٧٤ تا ١٩٧٧ ، نرخی قازانج لە ٥ر٤٪ بۆ (٢ر٦٪) بەرز بووەوە . وە نرخی قازانج‌و دانەوەی سەرمایە لە ساڵی ١٩٧٠ دا ، کە ٥ر١٢٪ بوو بەسەر دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو ، کەچی لە ساڵی ١٩٧٩ دا گەیشتە نزیکەی ٤ر١٦٪ . وە رەنگە ئەم رادەیەش لە ساڵی «١٩٨٥»ەوە خۆی بگەیەنێتە ٦٥٪ .

**٤ – کەمووکوریی رژێمی «بریتون وودس» :**

بەر لە چەند ساڵێك کۆنگرەی «اونکتاد» روونی کردبووەوە کەوا «رێکەوتننامەی بریتون وودس» ، لە بنەرەت‌دا ، لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو نەتەوە یەکگرتووەکانا وتووێژی لەسەر کرا بوو . وە هەرچەندکە زۆربەی دەوڵەتانی جیهانیش ، لەمانە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو ، بەشداریان تێدا کردبوو ، بەڵام دەورێکی ئەوتۆیان نەبوو کار لە بڕیارەکانی بکەن‌و ئەنجام بۆ بەرژەوەندی خۆیان وەدی بێنن» .

«اونکتاد» ، ئەو تەگەرە سەرەکیانەی کە ئەم رژێمە دووچاری بووە ، بەم شێوەی خوارەوە پەنجەی بۆ درێژ دەکات :

**أ – هیچ هۆو شێوازێکی ئەوتۆ لە**

«بنکەکانی یاری‌پێ‌کردن»دا نەهاتووە کە – بەوێنە – وڵاتانی دەوڵەمەند ناچار بکات زیاتر شت لە دەرەوە بهێنن یان قەرز بە وڵاتانی دەست‌کورت‌و هەژار بدەن . دیسان ، سنووقەکە بە گوێرەی هەندێ مەرجی گران کە بەندن بە سیاسەتی تایبەت بە بوودجەکەیەوە ، قەرز بە وڵاتانی هەژار دەدات ، کە ئەمەش لاسەنگی‌ی لەنێوان دەوڵەتانی هەژارو دەوڵەمەند پەیدا دەکات .

**ب – هیچ بەندێکی وا لە پەیڕەوە**

نوێیەکەوە نەهاتووە کە یارمەتیدان لە ئیحتیاتی‌ی دراوی دەوڵەتانەوە ، بە رێگای رێکەوتننامەی دەوڵەتی‌یەوە زیاد بکرێ بە پێچەوانەی زیادکردنی نرخی زێڕەوە .

**جـ – مەبەست لە سنووقی دراوی دەوڵەتانەوە**

ئەوە نەبوو کە وەك ئامێرێك بۆ هێمن بوونەوەی باری ئابووری جیهان لە کاتی چڕبوونەوەیدا ئیش بکات .

**د – سنووقی دراوی دەوڵەتان رووی** لەوە نەکردووە کەوا پێویستی‌یەکانی وڵاتانی تازەپێگەیشتوو بەجێ بگەیەنێت . سنووقەکە تا پاش ساڵی «١٩٦٣»ەوە قەرزی پێویستی پێشکەش بە دەوڵەتانی تازەپەرەسەند نەدەکرد . هەروەها راپۆرتی رێکەوتننامەی تایبەت بە سنووقەکە بە شێوەیەکی دیار ئەوەی رەچاو نەدەکرد کەوا مەرجی بازرگانێتی‌و مەرجەکانی پارەدانەوە ، زۆر جار ، لای وڵاتانی تازەپێگەیشتوو ، وەك وڵاتانی پیشەسازی ئاسان نی‌یە کەوا بێ زیان گەیاندن لابردرێن .

**هـ – پەیڕەوی نوێ دەسەڵاتی کەمی داوەتە** وڵاتانی تازەپێگەیشتوو کە بتوانن بڕیاری شت بدەن ، سەرەڕای ئەوەی کە کارکردنێتیان لە سنووقی دراوی دەوڵەتانەوە بێ‌هێزو کزە .

**٥ – بەرنامەکانی سنووقی دراوی دەوڵەتان**

**– تایبەت بە گونجاندن :**

ج – دی – لاروزییر – کارگێری بەڕێوەبردن لە سنووقی دراوی دەوڵەتانەوە ، بەرنامەکانی گونجاندنی وا خستووەتە بەر چاوەوە :

**«گونجاندن ئەوە ئەگەیەنێ کەوا لەو کاتەی سنووقی قەرز بە وڵاتانی هەژار دەدات تەنیا مەبەستی ئەوە دەبێت کە دەست کورتی‌یەکەی راماڵێت‌و ، وا لەو وڵاتانە بکات کە ، لەم کارەدا قازانج دەکەن ، لەسەر هەڵوێستی خۆیان بچێننەوەو بتوانن قەرزەکە بدەنەوە بۆ ئەوەی سەر لەنوێ سنووقی پارەکە بە قەرز بە وڵاتێکی‌تر بداتەوە» .**

ژمارەیێ لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو وا هەست دەکەن کەوا بەرنامەکانی گونجاندن گرانن‌و لەگەڵ ئامانجی گەشاندنەوەی ئابوورییان‌دا ناگونجێن . بە وێنە ، راپۆرتی لێژنەی «براندت» پەنجە بۆ ئەو تەگبیرانەی سنووقی دراوی دەوڵەتانەوە دایناوە درێژ دەکات کەوا زۆر جار : «دەبێتە هۆی کەم‌بوونەوەی بەکارهێنانی ناوخۆیێ ئەوەی وەبەرهێنان چاك‌و باش بێت . وە هەندێ جار ووزەی بەرهەم‌هێنان لە بەکاربردن‌دا کەمتر دەبێتەوە ، هۆکەشی ئەوەیە کە گەلێك لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو کە دووچاری هەژاری بوونە ، تووشی کەم خۆراکی یا کەمی‌ی شتومەکی

سەرەکی دێن ، یاخود ناتوانن خۆیان یەکسەر لەگەڵ دەرامەتیان‌دا بگۆڕن بۆ ئەوەی لەگەڵ باری پێویستی نوێ‌یاندا بگونجێنن . .»

لە لایەکی ترەوە راپۆرتەکە دەست‌نیشانی ئەوە دەکات کەوا سنووقی دراوی دەوڵەتان ئەرکی گران بەسەر دەوڵەتانی پەککەوتوو دەسەپێنێت کەوا قەبارەی ئابووریان کەم بکەنەوە . دیسان ، زۆربوونی ناردنەدەرەوە ، رەنگە یارمەتی هەندێ لەو وڵاتانەی دابێت کە رادەی ماڵ‌و دەرامەتیان ناوەنجی‌یە ، کەوا بودجەی پارەدانەوەیان باش بکەن . کەچی ئەم بارو مەرجانە نابێ بەسەر وڵاتانی جیهانی سێ‌یەم‌دا بسەپێنرێت ، چونکە بازاری جیهانی‌ی ، ئیستا ناتوانێ بە ئاسانی باوەش بۆ زیدەبوونی رادەی ناردنەدەرەوەکانی ئەم هەموو وڵاتانە بکاتەوە .

**د – دەزگای گەشەپێدانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان : ووتووێژی دراوی دەوڵەتان :**

هەر لە ساڵی ١٩٧٢ وە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو ، سەبارەت بە مەسەلەکانی دراوو دارایی‌یەوە بەردەوام ووتووێژیانە . لە ماوەی ٩٧٢ – ٩٧٤ وە ، لەو ووتووێژانەدا بەشداریان کرد کە لێژنەی بیستەم‌کە بەندە بە چارەسەرکردنی رژێمی دراوی دەوڵەتانەوە ، رێکی خستبوو . هەروەها لە کارەکانی لێژنەی بەروەخۆی‌ی سەر بە سنووق‌و لێژنەی هاوبەشی سنووق‌و بانقی دەوڵەتانەوە بەشداریان کردووە .

گەلێك جار وڵاتانی تازەپێگەیشتوو لەمیان ئەم ووتووێژانەیان‌دا ، ناچار تووشی ئەوە هاتوون کە بێ ئەوەی لە رووی تەقنی‌یەوە ئامادە بن ، وەڵامی پێشنیارەکانی وڵاتانی ترەوە بدەنەوە . لەبەر ئەمە بەرنامەکانی گەشەپێدانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٧٥دا بڕیاری لەسەر پرۆژەیەکی ناوچەیی دا کە «اونکتاد» جێ‌بەجێ‌ی کرد بوو . مەبەستی پرۆژەکە سەبارەت بە ئامادەکردنی (تقنی)ی گشتی بوو بۆ وڵاتانی تازەپێگەیشتوو بۆ ئەوەی بتوانن لە ووتووێژی دراوی دەوڵەتانەوە بەشداری بکەن‌و دەور بنوێنن .

**– دەزگاکانی دارایی دەوڵەتان :**

بەرنامەکانی گەشەپێدانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان ، کۆمەڵێ لێکۆڵینەوە بە ژمارەیێ لە پسپۆران لە وڵاتانی عەرەبی دەدات بۆ ئەوەی لە چۆنیەتی کاری دەزگاکانی دارایی دەوڵەتان‌و پێشنیارەکانی بکۆڵنەوە .

**هـ – سەرنج‌و بیرورا :**

«بەرنامەی گونجاندن زۆر گرانە . ئەوەندەش باسکراوە ، زۆر جار بە هەڵە بۆی چوونەو بەهەڵەش تێگەیشتوون . سنووق ئەم بەرنامەیە بە گوێرەی ئەم بۆچوونە ئاسانەی خوارەوە رای‌دەپەڕێنێت :

– لە بەرژەوەندی هیچ وڵاتێك‌دا نی‌یە دووچاری کەم‌پارەیی بێت لە بودجەی پارەدانی‌دا ، بێ ئەوەی ئیتر نەتوانێ ئابووری خۆی ببوژێنێتەوە بە رێگای زۆرکردنی سەرمایەوە . وە چونکە «مەرج دانان» بۆ راستکردنەوەی سیاسەتی گشتی‌یە ، وەك تەگبیرێك بۆ بەڵگەدانان سەبارەت بە پێشکەشکردنی یارمەتی دارایی بەکار دەهێنرێ .

بەڵام هەرچەند باری ئابووری بەرەو کزی‌و نەمان بڕوات ، ئەوە رادەی پێویست بە «گونجاندن» زۆرتر دەبێت . وە تەنیا بەم رێگایەش نەبێت ناتوانرێ باری گەشەپێدان‌و پێگەیاندن بپارێزرێت . وە لەو کاتەی پێویست بە «گونجاندن» دێتە پێشەوە ، ئەوە لەسەر وڵاتەکەیە بە ئەرکی سەرەکی هەڵبسێت .

بێگومان کارەکانی «گونجاندن»یش ئاسان‌و ساکار نی‌یە ، بە تایبەتی بۆ وڵاتانی هەژار . تاقیکردنەوەکان دەست‌نیشانی ئەوە دەکەن کە هەرچەند «گونجاندن» دوا بکەوێ کارەکانی گرانترو قورستر دەبێ .»

**کارگێڕی بەڕێوەبردنی سنووقی دراوی دەوڵەتان .**

**هۆیەکانی قەرز**

**هەرچەند گرانە کە رژێمی کۆنی ئابووری بە بەرگێکی نوێ داپۆشرێت ، بەڵام گرانتر ئەوەیە چۆن چارەسەری ئەو تەنگو چەڵەمانە بکرێت کە بوونەتە سەرهەڵدانی ئەم ناتەواوی‌یە لە رژێمەکەدا .**

**پێویست وایە شێوازێك بۆ وڵاتانی جیهانی سێ‌یەم بدۆزرێتەوە کە لە – نفقات –ی قەرز ، کە بەسەر یەکدا کۆ دەبێتەوەو ئێستا کە بە نرخی قازانج دادەپۆشرێت‌و بەردەوام بەرزدەبێتەوە ، رزگاریان بێت .**

**زۆر جار سەرنج بۆ ئەوە راکێشراوە کە – نفقات –ی قەرز لە ٩٪ لە ساڵی ١٩٧٣ بۆ ١٨٪ لە ساڵی ١٩٧٩ بەرزبووەتەوە . ئەم رادەیەش رەنگە بگاتە ٤٠٪ بۆ تاکە وڵاتان ، کە ئەمەش هەڵوێستێکی نابەجێ دەنوێنێ .**

**مایکل هدسون»**

## رژێمێکی نوێو بەجێی دراوی دەوڵەتان

کۆنگرەی شەشەمی سەرەك دەوڵەتانو حکومەتانی وڵاتانی بێلایەن ، بوودجەی– پارەدان –ی وڵاتانی تازەپێگەیشتووی دەستنیشان کردووە کەوا بۆ چەند هۆیەك دەگەڕێتەوەو سەرچاوەکانی لە دەرەوەی وڵاتانی تازەپێگەیشتوو دایە ، وە لە ئاکامی زۆرداریو نارێکیی «گونجاندن» سەری هەڵداوە کە ئابووری ئێستای جیهانی پێیوە بەندە . وە رژێمی دراوی دەوڵەتان ئێستاکە دۆخێکی وای سازاندوە کە بەشێکی نابەجێ لە گرانیی «گونجاندن» دەخاتە ئاستۆی دەوڵەتانی تازەپێگەیشتوو ، کە ئەنجامی ترسناك سەبارەت بە بەرنامەکانی پێگەیاندنیان دەدات بە دەستەوە .

سەرلەنوێ سەرەك حکومەتەکان دوپاتی ئەوەیان کردەوە کەوا پێویستە رژێمێکی نوێی دراوی دەوڵەتان بهێنە کایەوە ، بۆ ئەوەی ئەو نارێکیو کەم وکوورِیانەی لە رژێمی ئێستادا هەن لابیردرێتو دیموکراتیەت بە دەوڵەتانی تازە پێگەیشتوو بدرێت کە بتوانن لە کەشێکی پڕ لە دیموکراتیانەدا بیرورِایان بخەنە رووو مافی برِیاردانیان هەبێ .

«بڵاوکراوەی ئابووری – کۆنگرەی شەشەمی
سەرەك دەوڵەتو حکومەتانی وڵاتانی
بێلایەن – هاڤانا – أیلول / ١٩٧٩»

لە Development Issue Paper For The (1980) s
وەرگێردراوە

# کارتی ناسنامەی چاوەقوولە

«کۆلیرا»

فاتح عبدالکریم

لە گۆڤاری «صیاد»ی ژمارە (١٩٢٤) وەری گێڕاوە . .

● تاعوونی چاوەقوولە سالّی (١٨١٧) لە «دەلّتا دۆغانج» و «براهماپۆترا»ی هیندوستاندا ناسراو ، ئیتر لەوێوە بەهۆی زۆربوونی جموجوولّو ڕێگاوبانی دەشتو دەریاو ئاسمان ئەم نەخۆشیە بە شوێنەکانی تری جیهاندا بلاّوبوویەوە .

● نیشانەکانی ئەم نەخۆشی‌یە ؟

نەخۆشی‌ی چاوەقوولە شتێکی لەپرهاتووی بیّ نیشانەیە ، سەرەتاکەی بە ڕەوانی‌یەکی تێژو سك خالّی‌بوونەوە دەس‌پیّ‌دەکات ، ئەنجا لەش وشك‌دەبێتەوەو ئاوی تێدا نامێنێت .

ئەم نەخۆشی‌یە بەهۆی ئاوو خواردەمەنی پیسەوە ئازو گوێز دەکات .

ئەو منالاّنەی لە پێنج سالاّن کەمترن ، هەروەها ئەوانەی کە بەدەس پیس‌و پۆخلّی‌یەوە گیریان خواردوە زیاتر تووشی ئەم نەخۆشی‌یە دەبن .

● میککرۆبەکە چون ئازوگوێز دەکات ؟

لەگەلّ ئاوی خواردنەوەدا ، لەگەلّ خواردەمەنی دا ، لەگەلّ ساردەمەنی‌دا لەگەلّ ئەو دوندرمانەدا کە بەدەست دروست دەکرێن ، بەهۆی ئەو سەوزەجاتەی بەکالّی‌و بیّ میکرۆب کوشتنیان دەخورێن ، بە هۆی مێش‌و قولانچەوە کە بە قاچەکانیانەوە میکرۆبەکە هەلّدەگرن .

● ترش دژی کۆلێرایە ، بۆیە میکرۆبی ئەم نەخۆشیە لە ماست‌و شەربەتە غازەمەنی یەکاندا زیاتر لە تاقە ڕۆژیّ نارژیت ، لە کاتێکدا کەلە میوەی تازەووشك کراوەو دانەوێلّەدا (٣) ڕۆژ ئەمێنیّ ، بەلاّم لە خواردمەنی کولاّوو جل‌وبەرگی پیس‌و لە پێست دا حەوت ڕۆژ دەوام ئەکات‌و ، لە ماسی‌و گۆشتدا پێنج ڕۆژ .

هەروەها لەناو پارەوپوولی وەك پەنجاپی دا دوو ڕۆژو ، لەو شتانەدا کە لەشیر دروست دەکرێن حەوت ڕۆژ دەمێنێتەوە .

● ڕێگای خۆلیّ پاراستنی :

١ – لەپێش هەموو شتێکدا دروست‌کردنی ئاوەڕۆی پاك بۆ ئاو .
٢ – چاودێری کردنی ئاو و میکرۆب کوشتنی .
٣ – شیرو ئەوانەی لیّ‌ی دروست دەکرینّ دەبیّ بکولّێن .
٤ – چاودێری‌یەکی تەندروستی‌یانەی وردی ئامادەکردنی خواردن‌و پێش‌کەش کردنی .
٥ – شۆردنی هەردوو دەست .
٦ – نەهێشتنی مێش ! !

● لەکاتی توش‌هاتن‌دا لەسەر دوکتۆر پێویستە وەزارەتی تەندروستی ئاگادار بکات‌و ، نەخۆشە کە لە خەلّق جیابکەنەوەو ، ئەو قاپ‌و قاچاغ‌و جێگاو ، ئابدەس خانەی کە نەخۆشەکە بەکاری هێناون پێویستە پاك بکرێنەوەو میکرۆب کوژ بکرێن .

کنستانتین ئیستانیسلافسکی له ساڵی (١٨٦٣)دا ماوەیەکی کەم پاش نەمانی یاسای بەندەفرۆشی ، ئازادکردنی بەندایەتی لەشاری مۆسکۆ لەدایك بووە .

ئەم رِوداوە گرنگ‌و کەم وێنانەی که لەسەردەمی ژیانی (٧٥) ساڵەی ئەودا روویدا ، کارێکی زۆری بەسەر تەرزی بیرو کاری ئەودا هەبوو .

ئستانیسلافکی بەشداری لەجەنگی یەکەمی جیهانی‌و شۆرشی گەورەی روسیادا کردووە . له ساڵی ١٩٣٨دا کاتێ بڵێسە سوتێنەرەکانی جەنگی جیهانی دووەم گەڤی لەئەوروپا دەکرد . ئەویش چاوی له دنیا لێك‌نا .

لەماوەی (٧٥) ساڵەی تەمەنی ئەودا گۆرانکاریەکی گەورە لەجیهاندا رووی داو ، هونەری (ئیستانیسلافسکی)یش هەمووده‌م لەگۆران‌و پێشکەوتن دابوو ، رەنگ دانەوەی سەردەمەکەیشی بوو .

هونەری ئیستانیسلافکی لەئەنجامی کاری گەرانێکی بەردەوام بوو . فێربوونی تازەو لێکۆڵینەوە شێوەیەکی کاملی پێ‌بەخشی .

ئیستانسلافسکی نازناویەتی ، ناوی راستی (کنستانتین ئەیکس)ەو منداڵی یەکێك لەخێزانە خۆش‌گوزەرەکانی مۆسکۆ بوو . لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم‌دا چینی بۆرژوای روسیا زیاتر لەپێشدان خۆی لەهونەر نزیك دەکردەوەو . خۆیشی وایپیشان دەدا که پەیوەندیەکی نزیکی لەگەڵ هونەرو رۆشنبیری‌دا هەیە .هەر له تەمەنی چواردە ساڵیەوە چووە سەر تەختەی شانۆی تایبەتی خێزانەکەیان . هەر بۆیەش شێوەی پەروەردەکردنی خۆشەویستیەکی قووڵی بۆ ئەم هونەرە لەلاچەسپاندو هەروەها پەیوەندی بەپیشەی هونەر وەك میراتێك لەخێزانەکەیان بۆمایەوە .



گوشاد حمه سعید
ئامادەی کردووه

دایکی کچی (ماری وارلە)ی هونەرپیشەی فەرەنسایی بوو ، هەروەها دووخوشك‌و دووبراشی بوونە هونەرمەندو دەرهێنەر .

ئیستانیسلافسکی لەساڵی (١٨٨٨)دا له دروست‌کردنی کۆمەڵەی هونەری لەشاری مۆسکۆدا بەشداری کردوو ، زۆر دەوری لەنواندنی شانۆگەریە بچووکەکان وەرگرت تا دەوری کەسە تراژیدیەکانی شیللرو شکسپیری نواند .

لەوکاتەدا که (ئیستانسلافسکی) خۆی بۆ (دەرهێنان) وکاری هونەری ئامادەدەکرد ، بریاریشی‌دا رووبکاتە دەوروبەرە هونەریەکانی مۆسکۆ تەماشاکەرانی ئیستانسلافسکی لەریالیزم‌و بەرهەمە نوێ‌یەکانی سەریان دەسورِما زۆر شێوەی تازەی لەکاری نواندن‌و تەرزو رێگای جێ‌بەجێ‌کردن (تنفیذ) داهێنا .

ئیستانیسلافسکی لەکەرەتی یەکەم‌دا دلێرانەهەنگاوی دەنا لەرێی داهێنان دژی شێوەو رەوشت‌و دابە کۆنەکان‌و دژی چمکە کۆنەکانی جوانی تێ‌دەکۆشا .

یەکێك لەرەخنەگرانی فەرەنسی کەئیستانیسلافسکی بەوە تاوانبارکرد گوایە لەنواندی (ئوتیللۆ)دا ریزی شێوازو بریارە کۆنەکانی نەگرتووە دەڵێ : (باوەربکەن که فرمانی ئێمە ئەوەیە دابو رەوشتە کۆنەکانی لەهونەر دورخەینەوەو لەجێی ئەودا داهێنان‌و دروست کردنی شتێ‌نوێ پێك‌بهێنن ، تەنیا بەم رێگایەش دەتوانرێ هونەر رزگار بکەین .

لەساڵی ١٨٩٨ دا ئیستانسلافسکی لەگەڵ «ڤلادیمیر نمیرویچ» شانۆگەری نوس‌و رەخنەگری شانۆیی بەناوبانگ شانۆی هونەری مۆسکۆیان دامەزراندو ، یەکەمین کارێکیش کەکردیان تراژیدی مێژوویی (ئەلکسی تولستوی) که ناوی تزاز فئودورایو وانویچ) بوو بەڵام هونەری شانۆگەری واقیعی لەگەڵ نواندنی (مەلی دەریایی) چیخۆف‌دا هاتەکایەوە ، ئیستانسلافسکی‌و (نمیرویچ ) لەسەرەتادا بەرهەمەکانی چێخوف‌و ماوەیەکی کەمیش پاش ئەوە ، بەرهەمەکانی (ماکسیم گۆرکی )یان هێنایە سەر رووی شانۆو شانۆگەریەکانیان کارێکی بێ‌پایانیان لەپێشخستن‌و پەرەپێدانی شانۆی هونەری کردو بۆ ماوەیەکی دوورو درێژیش رێبازو کاکڵی ئەویان دیارکرد .

ئیستانسلافسکی پەیوەندیەکی هونەری‌و گیانی بەگیانی لەگەڵ چیخۆف پەیدا دەکاو . بەرە بەرە ئەم پەیوەندیە بۆ برادەرایەتیەکی قول دەگۆرێ .

شانۆگەریەکانی چیخۆف خۆی

لەخۆیدا تازەیەو بێ ئەوەی کەس پێش ئەو ئەم بابەتانەی نووسی بێ‌و دەرهینانیشیان پێویستی بەداهینان‌و ڕیٚ‌و ڕەنگ‌ڕشتنی تازەیەو پێویستە هونەری دەرهێنانی نوێش بەوەچەی فێربوون‌و لێکولینەوە بزانرێ .

یستانسلافسکی لەبینینی دەوری پالەوانەکانی (چیخۆف)و (گۆرکی) بێ‌وێنەیە هەروەها تیپی شانۆی هونەری مۆسکۆ لەنواندی شانۆگەری نووسەرە بێگانەکانیش وەك . هاوپتن وئیبسن‌و میترلیگ‌دا بەناوبانگە .

ئیستانسلافسکی لەسەردەم لاوێتی‌دا بەگوێرەی توانا تێ‌دەکۆش شانۆ زیاتر لەسروشتی تەماشاکەرانی نزیك بکاتەوە پاشدان بەتێگەیشتنێکی قووڵتر سەیری هونەری دەکرد ، تائەوکاتەش پەیوەندی خۆی بە «سمبولیسم» نیشان دەدا .

پاش سەرکەوتنی شۆرشی ئۆکتۆبەر ئیستانسلافسکی هەموو تواناو گوڕی خۆی لەپێناوی قوتابخانەی ڕیالیزم‌دا خستەکارو هەر خۆیشی دەڵێ : «پاش شۆرش دەرگای شانۆ بەڕووی تەماشاکەرانی تازە کراوە کەخۆراکی سادەو تێرو تەسەلیان دەوێ بەلاٚم هونەر وەك «خواردن» نیە تاپێویستی بە دەرمان بێ بۆ جۆشدانی هەست‌و زەوقی ئەوکەسەی دەیخوا .

ئیستانسلافسکی ئیشی خۆی تەنیا بەجێ‌بەجێ‌کردنی بەرهەمەکان دیاری ناکا ، بەڵکو ڕووی کردە شاکارە کلاسیکیەکانی ڕووس‌و بێگانەو شانۆگەریەکانی ئیستروفسکی‌و گۆگۆل‌و پۆشکین‌و شکسپیرو مۆلێر بومارسیە هێنایە سەر تەختەی شانۆ ، ناوبراو تەنیا گۆڕانکاری نوێ‌ی لەکاری (دراما)دا نەکرد : بەڵکو لە ساڵی ١٩٢٤دا لەئاپارتمانەکەی خۆی‌دا کە کەوتبووە کۆلانی لئوپیوتسکی ئۆپرای (ئۆژن ئۆنگین)ی چایکۆفسکی بە تەواو پێشکەش کرد بەم کارەش گۆڕانکاریەکی زۆری لە شێوازی تێگەیشتنی شانۆی «لیدك»دا کرد کە تا ئەورۆژگارەش باوبوو . هەر لەو ڕۆژەش بەدواوە چالاکیەکانی خۆی لەنێوان کاری ئۆپراو درامادا دابەش‌کرد .

ئیستانسلافسکی بەپشت بەستن بە تاقی‌کردنەوەکانی خۆی‌و شێوازی کارکردنی ئەوانەی پێش‌خۆی‌و هەروەها هاوچەرخەکانی خۆی هەولی دەدا ڕێ‌پیشاندەری ئەکتەرەکان بکاو باشتر ڕێکیان‌بخا ، چونکە هەموو شتێك لە تێڕوانینی لاوان ساناو سادە خۆی دەنوێنی‌و ئەو سیفەتانەیش کە ئەکتەر پێویستی‌بەتی بۆگەیشتن بەڕیزی واقیعی بەم شێوەیە شی‌دەکاتەوە : ئەکتەر دەبێ وردبیرو تیژو بەزەوق بێ‌و توانای کارتیکردنی هەبێ و شت بەخێرایی لەبەربکاو لەبیری نەچێ ، هەستێکی بەهێزو توانای داهێنان‌و خەیاڵێکی بەپیزی هەبێ‌و بتوانی بەتەواوی خۆی بخاتە جێ‌ی ئەوکەسەی کەپیشانی دەدا ، دەبێ بەسەرو سەلیقەو تێگەیشتووبێ ، دەنگ و مۆسیقاو نەغمەکان ئەندازە بکات ، دەرکیان پی‌ببات ، ڕاستگۆبێ هێزی بەدیهیەتی داهێنانی هەبێ‌و بتوانی دەست بەسەر هەستی خەڵکی دابگرێ‌و کار لەهەستی تەماشاکەر بکات ، ئەکتەر دەبێ خۆی بۆ ڕێ‌ی سەخت‌و پڕمەینەت‌و درك‌و دال ئامادە بکات‌و شەیدای کاری خۆی بێ .

بەم شێوەیە گەڕان‌و کۆششێکی دوروو درێژ بەدرێژایی ساڵانێکی زۆر لەئاکامدا بووە هۆی سەرهەلدان‌و پەیدابوونی (سیستەم)ی تایبەتی سەر بەئیستانسلافسکی کەپاشدان ناووناوبانگێکی جیهانی پەیداکرد .

سیستەمی ئیستانسلافسکی کۆمەڵە ڕێگایەکە کەئامانجی سەرەکیان ئەوەیە ئەکتەر بخەنە سەر ڕێ‌ی ڕاست‌و ناچاریشی بکەن بۆ ئەوەی بەووردی ئەو دوو پێداویستە بناسێ ، کەئەوانیش گیان‌و لەشن ، کەتەکنیکە هونەریەکە لێرەوە هەڵدەقوڵی واتە جوڵەی لەشی ئەکتەرو چۆنیەتی دەربڕینی دەرونی ئەکتەر . هونەرمەند دەبێ لەگەڵ توانای خستنەڕوو ڕێ‌نیشاندانی فیکری هەبێ‌و دەبێ لەگەڵ هێزی داهێنانی خۆی ، تەماشاکەر بخاتە ناو حالەتێکی ڕۆحی‌یەوەو لەم بارەیەوەش دەڵێ : هۆڵی شانۆ گرنگترین کورسی فێربوون‌و خوێندنەوەو گرنگیشی لە کتێبەکان پترە . ئەو کۆششەی من بەگوێرەی توانای خۆم دەیکەم لەبەر ئەوەیە کەبۆ نەوەی داهاتوو ڕوون بێتەوە کە ئەکتەر مامۆستاو پەیامنێری ڕاستی‌و جوانییە .

هونەرمەند دەبێ داب‌و نەریتە کۆنەکانی کە وەك تەونی جاڵجاڵۆکە لەڕووی شانۆ ئاڵاٚون بدرێنی لەلایەکی دیکە دەبێ ڕێ‌ی لەناو بردنی (ناتوارالیسم) بگرێتەبەر .

چەند دەرهێنەرێك کە بەناوبانگترینیان «میوهولد»و «ئەختاگنف»و «سۆلدژنسکی»و «دیکی»ین‌و هەروەها زۆر لەئەکتەرە بەناوبانگەکانیش لایەنگیر یان قوتابی ئەو بوون ، بیرو باوەڕەکانی ئەویان بەهەموو وولاٚتانی ئەورووپاو ئەمەریکادا بلاٚوکردەوە .

ئیستانیسلافسکی لەگەل زۆر لەو هونەرمەندانەی کە دەهاتنە ڕووسیا یان

**ئەوانەی کە لەگەڵ تیپی (شانۆی هونەری) سەفەریان بۆ ئەوروپا دەکرد یەکتریان دەبینی‌و برادەرایەتیەکی زۆریشی لەگەڵیاندا هەبوو وەك (گوردن کریك) ماکس رینهارت) (ئەندرە ئەنتوان)و (دراك کۆپۆ) کە ئەوانە ئەویان بەمامۆستای خۆیان دەزانی .**

**ئیمرۆ کاری ئەم دەرهێنەرە رووسانە لەچوارچیوەی شانۆیەکی کامل‌و لەسەراپای ولاتانی دنیادا زۆر بەقوڵی دیارە هونەرمەندە گەورەکانی فەرەنساو ئیتالیا وەك «ژان ویلار»و «ئەدوارد دوفیلپو» باوەریان بەوە هێناوە ، هەروەها پێشرەوانی شانۆی ئینگلیزی‌و ئەمەریکایی‌و ژاپۆن‌و چین‌و چیکۆسلوفاکی پۆلۆنی‌و ئەلبانی‌و زۆر لەوولاتانی دی ، پەیرەوی‌کەری قوتابخانەی ئەون .**

**«دوا لاپەرەکانی وەسیەت‌نامە هونەریەکەی ئیستانسلافسکی»**

سەردەمی لاوی بووە سپیرێك ، دواشانۆی ژیانیشم نزیك دەبێتەوە ، وەختی ئەوە هاتووە کەلەبەر رۆشنایی رابردوو رەسم‌و بەرنامەیەك بۆکارەکانی ئایندە رێك بخەم ، لەلایەك دەهێنەری‌و ئەکتەریشم کرد و شانۆگەریم هێنایە سەر تەختەی شانۆو (لەلایەکی دیکە گیانم دەهێنایە بەر جیهانی دەروونی ئەکتەرو هەموو ریێو وەسیلەیەکم (هۆیەکم) تاقی‌کردەوەو قەرزەکانی خۆم بە رێبازە جیاجیاکانی شانۆ لە «ریالیست‌و تاریخی‌و سمبولیست‌و ئیدیولوژیك) دایەوە . زۆر بیرو باوەری جیاجیام موتالاکرد ، «ریالیسم – فوتوریسم ، معماری ، پەیکەرتاشی – هتد بەوردی‌و کاری رۆشنای جۆراوجۆر کردنم تاقی‌کردوە ، لەدواجاردا گەیاندمیە ئەوە کە هیچیەك لەوانە زەمنیەیەکی بەپیزبۆ هونەرمەند دروست ناکات ئەو دەوروبەرەی کەمن حەزی لی‌دەکەم دەبێ سادەبێ بەلام ئەوسادەیی‌یەی کە لە منداڵدانی گەرانو لیکۆڵینەوەو داهێنانێکی زۆرەوە بوو بێ ، نەك بێ پێزو (هەژار)و ناچیز بێ .

نازانم دەبێ چبکەم تا ئەو سادەییە وەك ئارایشتێکی بی‌ماناو سەرسورهێنەر نەبێ ، چونکە ئەم جۆرە ئارایشت‌و جوانکاریانە لەبەرچاوی ئەوکەسانەی کەلەگەڵ دەوروبەری شانۆ ئاشنایان زیاترە جوانتر خۆی دەنوێنی ، خۆزگە رۆژێك هونەرمەندێکی گەورە دەهاتە دنیاو ئەو مەسەلەیەی کەدژوارترین مەسەلەی پەیوەند بەشانۆیە چارەسەر دەکرد : بەلام لەبارەی کاری رۆحی‌و فیکری ئەکتەرەوە هەموو شتێك بەدەست تواناو هێزی دەرك پی‌کردن‌و توانای هونەری هەریەکێك لەهونەرمەندانە دەروا بەرێوە .

هەندێك لەو باوەرەدان کە ئەکتەر تەنیاپێویستی بە توانای کارکردن‌و ئیلهام هەیەو هەندێکیش دەڵین هونەر لەهەموو شتێك پێشکەوتوو ترە ، ئەگەر چمکەکەشی «واتە هونەرمەند» هێزو توانای ئیش‌کردنی تێدابێ زۆر باشترە . ئەگەر دەستەی دووەم تا ئەو رادەیە سەریان لەژیانی دەروونی‌و رۆحی ئەکتەر دەسورمێ لەبەر ئەوەیە کەخۆیان توانایان نیە لەسەر تەختەی شانۆ هەستێکی واقیعیانەیان هەبێ‌و لەناو دەورەکانی خۆیاندا بژین ، چونکە لەسەدا نەوتی کاری ئەکتەر لەدەرك کردن‌و هەست‌کردن بەدەورەکەی خۆی‌و تێداتوانەوەیەتی‌و ئەگەر گەیشتە ئەو ئەنجامەش ئەوە مانای ئەوەیە کارەکەی خۆی ئەنجامداوە ، ئەوبەری ناتێگەیشتنیشە کە لەسەدا نەوەتی کارەکە بەدەست رێککەوت بسپێرین .

یاسا بۆ هونەرمەندە بەهێزو تواناکان دانەنراوە ، بەڵکو ئەوان خۆیان یاساکان دادەنێن‌و دەیان هێننەدی ، بەلام لەبەرچی هەرگیز ئەکتەری بەهێزو توانا نکۆڵی لەسوودو بایەخی هونەر ناکا ، بەڵکو بەپێچەوانەوە لەو باوەرەدایە کەشت بەدەست هێنان‌و ووردی لە هونەردا گرنگترین فرمانی هونەرمەندە ، ئەکتەر هەرچەندەکی مەزنتربێ پەیوەندی خۆشەویشتی خۆی زیاتر پیشانی هونەردەدا ، تاوەکو هونەریش بەزانیاری لێهاتوویی لەرادەبەدەر موتوربە نەکرێ ، نابێتە هونەرێکی واقیعیانە ، هەرلەبەر ئەوەش «دگا» دەی‌ووت : ئەگەر نرخی سەدهەزار فرانك لێهاتوویت هەیە تێکۆشە تابەقەدەرایی پێنج «پوولی» دیکەبکری . پێویستی ئەو راستیە لەهونەر لە هەموو شتێك زیاترە ، بەپێچەوانەی هەموو هونەرەکانی دی کە میژوو وەپێشکەوتنیان بەهۆی مۆزەخانەو کتێب‌و نووسراو پارێزراوەو بەنەمری ماوەتەوە . . داب‌و رێبازی هونەری شانۆ تەنیا بەهۆی ئەکتەرەوە زیندووەو روناکی ئاگرەکەیشی لەدەرەوەی شانۆ ناگاتە کەس . دەبێ دەست بخەینە ناودەستی یەك‌و تەنیا ریی سەرکەوتن‌و فێربوون‌و بەهۆی بەرپاخستنی‌و رۆشن‌کردنەوەو تیشك بە خشین ، ری‌نیشاندانی بەردەوام لەلایەن کارو کۆششی بەردەوام بەئیلهامیش موتوربەی بکەین .

هونەری نواندن لەولایەنەوە جیاوازی لەگەڵ هونەرەکانی‌دی هەیە ، چونکە هونەرەکانی‌دی دەتوانن چاوەریی ئیلهام بکەن ، لەکاتێکدا کە دەبێ جڵەوی ئیلهام لەدەست خۆی‌دابێ‌و لەوکاتەیش کە داوای لی‌دەکەن ئیلهام لەقووڵایی خودی

خۆیەوە بهێنێتەسەر رووی شانۆ ، نهێنی کار تێرەدایەو بەبێ ئەوەش کاملترین تەکنیك و شایستەترین توانا بێبەبەرهەم دەبێو بەدبەختی و حەسوودیان کلیلی ئەو نهێنیانە دەشارنەوەو تاگەورەترین مامۆستایانی شانۆش (جگە لەهەندێکی زۆر کەمیان) نەك تەنیا ئەو نهێنیو رمزانە بە دەستی قوتابیە لاوەکانیان ناسپێرن ، بەڵکو لەپشت پەردە ئەستوورەکان دەیان شارنەوە . ئەو یاسایانەی پەیوەندیان بەداهێنانەوە هەیە بەسیە بۆ ئسپاتی بوونی توانای دەرك پێکردن کارێکی بەنرخیش ئەنجام نادا ، هونەرمەند دەبێ یاسا ناوبراوەکان بەوردی بخوێنێتەوە ، چونکە ئەو یاسایانە تەنیا هێزی سەروی دەرك پێکردنیان (قوة مافوق ادراك) دەوروژێنن دەی خەنەکار ، ئەوەیش لەوانەماوە هەڵهێنیجرابێ ، لەناو ویژدانی ئێمە وەك موعجیزەیەك بەنەمری دەمێنێتەوە ، لەبەر ئەوە خوێندنەوەو ئاگاداربوونمان لەشێوەی ئیشکردن و پێشکەوتنی خەڵکیدی بەرەو حەشارگەو پێچ وپەنا نادیارەکان و سەرچاوەی ئیلهام رێمان بۆخۆش دەکاو دەست نیشاندەریمان دەکا . ئێمە دەبێ بۆ بەدەست هێنانی ئەو بیروباوەرو ئامانجانە هەوڵ بدەین کەنەوەی نوێو لاوان بۆخۆی رادەکێشێ . خوێندنەوەو دەرك پێکردن و تێگەیشتن ئەو شتانەی لەنلو دڵو گیانی لاواندا دەسورێتەوە ، کارێکی زۆرباشەو لەگەڵ ئەوەشدا ئارەزووبکەین لەوباوەروەوتە لە دوو شت دوورەپەرێز بین یەکەمیان : ئەوپیرەمێردەی کەخۆی ئارایشت دەکاو دەبەوێ لەگەڵ لاوان کاربکاو بەوئومێدی کەخۆی وەك هاوتەمەنی ئەوان بنوێنی (پیشان بدا)

دووەم : پیرەمێردێکی خاوەن تاقیکردنەوە کەوەك لەهەمووشتێك گەیشتنیو بەدخوو توورەبێیە ، هیچ هەوڵێکی تازە قبول ناکاو هەموو هەوڵ و کۆششەکانی دەوری لاوێتی خۆی لەیادکردووە .

من واحەزدەکەم کە لەدوادوای ساڵەکانی ژیانمدا وەك چۆن هەم وابم ، واتە بەشێوەیەك دەبێ وەك چۆن لەسەر یاسا سروشتی یەکانیشم کردووەو ژیاوم هەروابم ، بەڵام من کێم و لەوجیهانە نوێیەی کەبۆ شانۆ دێتەکایە هیچ پایەیەکم هەیە ؟ دەرك بەوشتانە بکەم ئایا توانای ئەوەم هەیە کەوەك رابردوو هەست بەوشتانە بکەم کەلاوان بایەخی پێدەدەن و سەرگەرم و شەیدایانن ؟ دەبێ دان بەوە دابنێم کەوەك لەش هەرگیز توانای ئەوەم تێدانەماوە بەخوێندنەوەی ژیان و هونەری من پەی بەشێوەی پەروەردەکردنی من دەبەی ، ژیانی رابردوومان لەگەڵ هەرچی لاوانی سەردەم هەیە بەراوردبکە چۆن دەتوانین ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی خۆمان بگەیەنینە دەستی لاوان و لەوهەڵانەش دووریان خەینەوە کەبەهۆی کەم تاقیکردنەوە تووشیان دێن .

هەر وەختێك کەسەیری سەراسەری ژیانی هونەری خۆم دەکەم دەمەوێ خۆم لەگەڵ ئەوکیمیاگەرە بەراوردبکەم ، کەماوەیەکی درێژ لەناو درك ودار بگەرێ پاشدان ئەو شارەگەی کە مەرامیەتی ببینێتەوەو خەرواره‌پڕ لە ورتکە بەردەکان سووربکاتەوە تاوەکو چەند مسقاڵە فلزێکی بەنرخی وەچەنگ کەوێ منیش وەك «کیماگەر» ناتوانم بەری رەنجی خۆم بدەمە کەسێکیدی ، بەڵکو تەنیا دەتوانم ئەو زێرەی کە پەیدام کردووە نیشانیان بدەم .

ئایا ئەکتەرەکان لەکاتی نواندن لەبیری (چۆنیەتی) یان (چەندێتی)دان ؟ ئەو دەرهێنەرانەی کە هەست و شێوەی تێگەیشتنی خۆیان لەبارەی نواندنی دەورێکەوە بەسەر ئەکتەرەکاندا دەسەپێنن دەکەونە ناو هەڵەیەکی گەورەوە ، ئەوکارە سنووری ئەکتەرەکان دەبەزێنێ ، چونکە دەرهێنەر کاری تایبەتی خۆی هەیە ؟

دەرهێنەر دەبێ پێش هەمووشتێك دەرك بەمەیلی ئەکتەران بکا هەموو وجودی ئەوکەسانە بناسێ کە لە جێبەجێ کردنی شانۆگەریەکە بەشدارن و لەلای خۆی بریار لەسەر توانای داهێنان وگیانی هونەری نوێنەران بداو هەروەها ئەویش کەدەتوانرێ بهێنرێتەدیو ئەویش کە دەبێ چۆن بهێنرێتەدیو ، بەپێچەوانەوە ئەگەر هەستی تایبەتی خۆی بسەپێنی ، ئەوا هەرگیز ناتوانی توخمە بزوێنەرەکانی ژیان لە ئەکتەردا درووست بکا ، چونکە شتێکی بەدیهیە (باوە) کە لە توخمە بێگیانەکان بەرهەمی بێگیان دێتەبەرهەم .

رەخنەگری بەتوانا دەتوانی بێتە یارمەتی دەری ئەکتەر بۆ کۆمەك کردنیشی خۆی بە رابەرێك بزانی کەرێنمایی ئەکتەر بکا لە خۆناساندنی بەخەڵك . ئەگەر رەخنەگری بێتوانا بەبالای ئەکتەر هەڵبڵێ ئەوا زیان لەئەکتەر دەدا .

لەژیان هیچ شتێك دووبارە نابێتەوە . هەرگیز دووکەس یان دووفیکر یان دوو هەست ونەست ناتوانن ببنەیەك . ئەوهەست و نەستەی کەئەکتەر ئێمرو لەسەر رووی شانۆ دەینوێنی سبەینێ ناتوانی دووبارەی بکاتەوە ، هەربەم شێوەیە هیچ جۆش خواردن و هەڵچوونێك ناتوانی هەتاهەتایە سیمایەکی دیاریکراوی هەبێ . بەڵکو دەبێ خۆی لەخۆیدا بێتەکایەوە .

# منالێ

«ناوم کوێکۆهەو تەمەنم نۆ ساڵانە . خەڵکێکی زۆر بە (هەتیو !)م بانگ ئەکەن ، بەڵام من بەتەنیا ئەژیم . لەوکاتانەدا کە سینەما ئیش ئەکا ، من لە مەیدانی (ئۆردۆن) بنێشت ئەفرۆشم . کوڕو کچێکی زۆر بەرلەوەی بچنە سینەماوە بنێشتم لێ ئەکڕن . ناچمە قوتابخانە ، چونکە پارەم نی یە . دایکم بەسەر منەوە ڕۆیشتووەو ، باوکیشم کەس نازانێ کێ یە . کە هێشتا بەرمەمکان بووم ئافرەتێك شیری خۆی داومەتێ . بەڵام

نووسینی
د احمد ابوزید

ئێستا وا گەورە بووم‌و کارئەکەم . شەو دڕەنگێ ئەنووم ، سەعات دوو ، جارجاریش سەعات سێی شەو .ماڵم نی‌یە تیا بنووم ، بۆیە لە ئێسگەی بەنزین ئەنووم . لە وکەل‌وپەلانە ئەکڕم کە لەسەر پیادەڕەوی شەقامەکان ئەیانفرۆشن . جیهان پڕە لە کەسانی نەخۆش . من هیوام وایە ساڵی ۱۹۷۹ ساڵێك بێ بێ‌جەنگ‌و بێ‌منداڵی‌وا کە وەك من بێنە دنیاوە . . من نارەحەتی‌یەکی زۆر ئەچێژم . نە سابوون شك‌ئەبەم‌و نە شەکرو نە گەلێ شتی زۆری‌تریش . . هیوام لە ساڵی ۱۹۷۹ ئەوەیە شوێنێکم لەگەڵ خۆی بۆ بێنی تیا بحەوێمەوەو ، ئاویش بۆ خەڵکی ئاوایی بێنێ بیخۆنەوە . وێنەم مەگرە ، حەزناکەم پیاوی چەرموو بەم چەپەڵی‌یەوە بمبینێ» .

لە سەرەتای ئەم سەدەیەداو ، دەق لە ساڵی ۱۹۱۲ دا ، ماریا مۆنتیسۆری Maria Montessori کە نەك هەر لە ئیتالیادا ، بەڵکو لە هەموو جیهانا ، بە یەکێ لە گەورەترین زانایانی پەروەرشت دائەنرا ، نووسی کەوا : ئەبێ لە سنووری سوودی کۆمەڵەدا ڕێگای ئازادی بە منداڵ بدرێ ، چونکە تەنها ئەم شێوە ئازادی‌یە ، بە ڕاستی ، بە نموونەی پەروەرشتی باش دائەنرێ . لەبەز ئەمەیە پێویستە لەسەرمان هەرشتێکی‌وا لە منالا کە لەوانەبێ ببێ بە مایەی ئازارو نارەحەتی بۆ خەڵکی‌تر ڕایگرین‌و ڕێگای نەدەین ، هەروەها هەرچی لەوانە بێ پاڵی پێوە بنێ بۆ زۆر بەکارهێنان یا ڕەوشتی ناشایستە . ئەم وتە کورتە سەرەتایەکی گرنگ‌و گشتیی تیایە لای هەموان دەنگ‌ئەداتەوە ، چونکە ئەوە بۆ منداڵ مسۆگەرو دابین ئەکا کەوا کەڵك لە ئازادیی خۆی وەرگرێ ، هەرچەند سنوورێکیش بۆ ئەم ئازادی‌یەی دائەنێ‌و ئەیبەستێتەوە بە سوودی ئەو کۆمەڵەوە کە ئەچێتەوە سەری . هەروەها دان بە مافی (کارکردن) و بەرەڵلابوونی منداڵیشدا ئەنێ تا بتوانێ خۆیەتیی خۆی بەدی‌بێنێ‌و هەلی تەواوی دروست‌کردن‌و داهێنان بۆ خۆی فەراهەم بکا ، کە ئەمانەش هەموو ڕەگەزی گرنگن بۆ پێکهاتنی کەسایەتیی تەواوی‌وا کە بتوانێ لەگەڵ کۆمەڵدا بگونجێ .

کەواتە ئامانجی سەرەکیی پەروەرشتی ڕاست ، بە ڕای ماریا مۆنتیسۆری ، هێنانەدیی هاوسەنگیی ژیواری‌یە لەنێوان ئازادی‌و لێ‌پرسینەوە ، لەنێوان داهێنان‌و دۆزینەوەو پەل‌هاویشتندا لەلایەکەوە ، لەگەڵ سیستێم‌و لە ئەستۆگرتندا لە لایەکی‌کەوە ، وەك بێل موونی Bel Mooney لەوکتێبەیدا ئەڵێ کە تەنها چەند هەفتەیەکی (لە سەرەتای تەمووزی ۱۹۷۹دا) دەرچووەو ، بەبۆنەی ساڵی جیهانیی منالانەوە لێکۆڵینەوەیەکی خۆشی سەبارەت بە دوازدە باری چەند منالێکی هەڵبژاردەی چەند ناوچەی جیاجیای بەریتانیا تێدا پیشان‌ئەدا . بێل موونی لەم لێکۆڵینەوەیەیدا ئەو ڕەگەزە ڕەوشتی‌و پەروەرشتی‌و کۆمەلایەتی‌یانەمان بۆ دەرئەخا کە لە پێکهاتن‌و پێگەیشتنی ئەم منالانەدا هاوبەشن .

هەروەها ئەوەشمان بۆ دەرئەخا کە ئەم ڕەگەزانە تا چ‌ڕادەیەك لە هێنانەدیی ئەم هاوسەنگی‌یەدا سەرکەوتوون (بروانەرە :
Bel Mooney
The year of the Child: Portraits of Children, Hutchinson, London, 1976)

بەلام ڕاستەکەی ماریا مۆنتیسۆری گەلێ لەمە دووتریش ئەڕوا ، چونکە ئەوەتە ئەڵێ : «ئێمە بەتەواوی پێ نازانین ئەنجامێکی چەند خراپ‌و زیانبەخش لەوە ئەوەشێتەوە کە هەر لە سەرەتاوە هەر کارێکی خۆبەخۆیی سەرکوت بکەین کە لەوانەیە منالێك بیکا ، هەر ئەوەندە ئەو منالە بی‌یەوێ یا حەزبکا ئەو کارە بکا . چونکە ئێمە ئەگەر وابکەین ، لەوانەیە بەوکارەمان خودی ژیانمان لەو منالەدا خنکاندبێ . . مرۆڤایەتی خۆی‌و هەموو جوانی‌و بەرزیی عەقڵیی خۆی لەو تەمەنە زووەوە دەرئەبڕێ ، دەق وەك چۆن ڕۆژیش هەر لە بەرەبەیانەوە خۆی دەرئەخا . . وەك چۆن گوڵ کە چرۆ پێشینەکانی خۆی دەرئەخا . لەمەوە پێویستە بە چاوی ڕێزلی‌گرتنەوە بڕوانرێتە ئەم پێوەندە سەرەتایی‌یانەی قەوارەی تاکە مرۆ» . کەواتە لە شەست‌و حەوت ساڵ لەمەپێشەوە ئەم بیرو ڕایانە لە ئارادان‌و ، لەو سەردەمەدا بە بیرو ڕای یاخی‌و شۆڕشگێڕانە ئەدرانە قەڵەم ، بەلام وا ئێمە ئەمڕۆ پەسەندمان کردوون‌و ملمان بۆ کەچ کردوون ، هەرچەند بۆ چوون‌و بیریشمان لەوەدا جیاوازیی تێدا هەبێ کە چ ڕێگاو شێوەیەك لە هەموو چاترە بۆ ئەوەی بتوانین سوودی تاك‌و سوودی کۆمەڵ یان ئازادی‌و بەرپرسیی پێ یەك‌بخەین . لەگەڵ ئەوەشدا کە دان بەوەدا نراوە کەوا پەروەرشتی ڕاست – ئەگەر پەروەرشتێکی ڕاست هەبێ – لە یەك‌خستن‌و پێکەوە گونجاندنی ئەم دوو ڕەگەزە سەرەکی‌یەدایە ، هێشتا جیاوازی‌یەکی زۆر لەنێوان کۆمەڵگا جیاجیاکاندا هەیە ، لەوەدا کە هەر یەکە قورسایی ئەخەنە سەر یەکێ لەم دوو ڕووە نەك ئەوی‌کەیان ، بەجۆرێ کە ئەبینین

کۆمەڵگا تازەکانی ڕۆژاوا مەیدانی بەشێکی زیاتری ئازادیی شەخسی ئەدەن ، ئەنانەت وایان لێ هاتووە بە کۆمەڵگای بەرەڵڵایی و ئازادی ناوئەبرێن Permissive Societies کەچی کۆمەڵگای تر هەن پێویستیی بەرزکردنەوەی دەسەڵاتی کۆمەڵەو سەرپەرشتی کردنی و دەسەڵات پەیدا کردنی بەسەر تاکدا دووپات ئەکەنەوەو قورسایی ئەخەنە سەر بەرپرسیی تاك لەئاستی کۆمەڵەدا ، وایش ئەبێ ئەوەندە لەم مەیدانەدا زیادەڕەوی ئەکەن کۆمەڵە تاکایەتیی مرۆو قەوارەی سەربەخۆی مرۆو کەسایەتیی خۆیی ئەو پێ شێل ئەکا . بۆیە پێکەوە گونجاندنی ئەم دوو ڕووە ، وەك ماریا مینتسۆری ویستوویە ، کارێکی ئێجگار زۆر سەختەو ، ڕادەی قورسیی کاری پەروەرشتیان بۆ دەرئەخا .

پەروەرشتی منداڵ ، هەرچۆن بێ ، سەرەنجامەکەی بریتی یە لە کارێکی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی یا سروشتی کردنی کۆمەڵایەتی و ، ئامانجەکەی بریتی یە لە هێنانەدیی هاوسەنگی لەنێوان منداڵ و ئارەزوو پێویستی یەکانی کۆمەڵدا کە ئەویش لە هەمان کاتدا دان بە تاکایەتیی منداڵ و سەربەخۆیی کەسایەتیی منداڵ و قەوارەو بوونیا ئەنێ .

وەك زانراوە ئادەمزاد تا ڕادەی ئەوپەڕی بێ دەسەڵاتی بێ دەسەڵاتە . ئادەمزاد بە درێژایی ژیانی ڕێگایەکی درێژی پڕمەینەت و پڕ لە هەڵوێستی نوێ و گۆڕانی کوتوپڕی وا بەسەرئەبا کە پێویستە لەسەری خۆی لەگەڵیاندا بگونجێنێ و لێیانەوە فێر بێ و بێ یانخاتە ژێر باری بەرژەوەندی تایبەتی خۆیەوە . پێ گەیاندنی کۆمەڵایەتی یان سروشتی کردنی کۆمەڵایەتی Social Zalion لە ناوکوروکەکەیدا لە کاری گونجانێکی بەردەوام بەولاوە لەگەڵ ئەم بارو دۆخ و هەڵوێستانە بەولاوە نی یە . هەر بۆیەیش ئەم پێ گەیاندنی کۆمەلایەتی یا سروشتی کردنی کۆمەڵایەتی یە لە ڕاستیدا پێوەندی بە تەمەنێکی تایبەتی یەوە نی یە بەتایبەتی و ، کورت هەڵناهێنێ لەسەر قۆناغێکی دیاری تەمەن ، بەڵکو بەدرێژایی تەمەنی ئادەمزاد درێژە ئەکێشێ ، هەرچەند ڕەگەزەکان و پێکهێنەکانیشی بەپێی گۆڕانی ئەو قۆناغ و تاقی کردنەوانە بگۆڕێن کە تاك پیایاندا ئەڕوا ، یا بەگوێرەی ئەو هەڵوێستانە لێك جیا بن کە تاك خۆیان تیادا ئەبینێتەوەو پێویست ئەبێ لەسەری کەوا ڕەوشتی خۆی دەستکاری بکا بۆئەوەی لەگەڵیان بگونجێ یا گوێیان بۆ شل کا یا بۆ سوودی خۆی بەکاریان بهێنێ . لەمەوەیە پێ گەیاندنی کۆمەڵایەتی یا سروشتی کردنی کۆمەڵایەتی شتێکی گەورەترو بەدەرەتانترو قووڵترو بەرفراوانترە لە تەنها پێ خوێندنی ڕەسمی و پەروەرشتی ڕەسمیی بەگوێرەی پرۆگرام و ڕێکوپێك ، کە منداڵ لە قوتابخانەداو پاشان لە ئامۆزگا جیاجیاکانی پێ خوێندندا وەری ئەگرێ . پێ گەیاندنی کۆمەلایەتی یا سروشتی کردنی کۆمەڵایەتی کارێکە لە یەکەم ڕۆژی لەدایك بوونی منداڵەوە دەست پێ ئەکا کە هەر لە سەرەتاوە خۆی لە کۆمەڵگایەکی دیاریدا بەدی ئەکا کە کولتوورێکی تایبەتی لە کۆمەڵگاکانی تری جیائەکاتەوەو ئەو کولتوورەیش لە کومەڵێ داب و نەریت و سیستێم و پێوەندی کۆمەڵایەتی پێکهاتووە ، بۆیە ئەمیش مل کەچی ئەو داب و نەریتانە ئەبێ و ئەبێ بە لایەنێکی گەلێ لەو سیستێم و پێوەندی یانەو ، پێوەندی یەکانی بەدرێژایی ساڵ ئەئاڵۆزکێن و ئەچن بەیەکداو لێ و پۆپی زۆریان لێ ئەبێتەوە . ئەمەیش خاڵێکی بایەخدارە لە کاری پێ گەیاندن یا سروشتی کردنی کۆمەڵایەتیدا هەموو ئەوانەی لە مەیدانی سایکۆلۆژی و زانستی کۆمەڵایەتی و ئەنترۆپۆلۆژی و پەروەرشتدا لەم بابەتە کۆڵیونەتەوە ، ئاگایان لێ بووە ، بەتایبەتی کاتێ کە خەریکی لێکۆڵینەوەی مۆرکی نەتەوەیی یان کەسایەتیی نەتەوەیی ئەبوون ، وەك چۆن هەموو ئەو مامۆستایانەی بە لێکۆڵینەوەکانیان لەم ژمارەیەی ئەم گۆڤارەدا بەشداری یان کردووەو باسی منالی و پایەکانی و گیروگرفتەکانی و گەشەپێدانی هەڵچوونی یان کردووە ، کەم تا زۆر دەریان بڕیوە .

بەڵام وەنەبێ ئەمە بەناچاری وابگەیەنێ کەوا ئەو منالانەی لە کۆمەڵگایەکی دیاری و کولتورێکی تایبەتیدا دێنە دنیاوە ، هەموو ئەبن بە وێنەی لەیەکچوونی یەك ڕیشە ، چونکە تاقی کردنەوەو شارەزایی و باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و خێزانیی هەرتاکێك لە هی تاکێکی تر جیاوازەو ئەمەشە مەیدانی ئەوە بەرەڵلائەکا جیاوازیی تاکایەتی لەنێوان ئەندامانی یەك کۆمەڵگادا پەیدا ببێ ، هەرچەند یەك زەمینەو یەك بنەرەتیش هەبێ کە هەموو منداڵەکانی ئەو کۆمەڵگایە تیا بەشدار بن . ئەم بنەرەتەیش بریتی یە لەو کولتوورەی لەناو کۆمەڵگاکەدا بانە . مەبەستمان لە وشەی (کولتوور) ئەو واتایایەتی لە بەکارهێنانی ئەنترۆپولۆژیاییدا ئەیگەیەنێ . دیارە باوك و دایك لە کاتی پێ گەیاندنی کۆمەڵایەتیی منداڵدا ڕۆڵی یەکەم ئەگێڕن ، مادەم ئەم کارە هەر لە لەدایك بوونی منالەکەوە دەست پێ ئەکان ، مادام منالیش لەناو خێزانێکی دیاریدا لەدایك ئەبێ کە وەك کۆمەڵگای یەکەم یا



ناوکی کۆمەڵگا وایە بۆیو پێویستە لەسەری خۆی بەگوێرەی ئەو لێ بکاو یەکەمینی ئەو کاریگەرانەي دەستیان لە پێکهاتنی ەیانیو ڕامکردنی ڕەوشتی کۆمەلایەتیی ئەودا هەیە ، لەوەوە وەرئەگرێ . باوکو دایك ، بە دەسەنقەست بێ یا بێئاگایانە بێ ، منالەکەیان بە ڕێگایەکی نەخشە بۆ کێشراودا ئەبەنو ملکەچی هەندێ شێوەی دیاریکراوی پەروەرشتی ئەکەن ، کە چەند ڕێبازو بیرو ڕاو باوەڕو بەهاو شێوە ڕەوشتی داب‌پێوەگیراویان تیایە . واتە باوکو دایك ، لە تێگەیشتنەوە بێ یا لە تێگەیشتنەوە نەبێ ، هەر لە سەرەتاوە کاری پێگەیاندنی مندالْ بە ڕێگایەکی دیاریدا بەڕێوەئەبەن ، هەرچەند دیارە کەسەکە خۆیشی پاشان ئەکەوێتە ژێر کارتێکردنی گەلێ کاریگەلیترەوە بەهۆی ئەوکەسانەوە کە لەگەڵیان هەڵئەستێو دائەنیشێ (وەك ئاوەلانی قوتابخانەو یاریو مامۆستاو هاوڕێیانی کارو کەسانیوا) یا لە دەوروباری فیزیکییەوە کە تیا ئەژی وەك ئەوە کە دەوروبەرەکەی شارستان بێ یا لادێ بێ یا بیابان بێ یا سنعاتکار بێ ، یا لە هۆیەکانی ڕاگەیاندنەوە وەك تەلەفزیۆنو سینەماو ڕادیۆو ئەم جۆرە شتانە . هەموو ئەم کاریگەرانە پێکەوە لەوەدا هاوبەشن کە کەسایەتیی ئەم کەسە پێکەوە ئەنێنو ئەقلی پێئەگەیەننو ، لەگەڵ کۆمەلو بەهاکانی ناو کۆمەلو ئامانجو کەلەپوورەکانی کۆمەڵیدا ئەگونجێنن ، واتە تاکە کەسەکە لە چوارچێوەی ئەو شێوانەدا کەوی ئەکەن کە کۆمەڵەکەی بەدرێژایی چەند چەرخ پێکەوەی ناون ، وەك چایلد J.L.Child لە کتێبە خۆشەکەیدا وتوویە کە ناوی ناوە (ئیتالیاییە یان ئەمەریکایی) کە لە سالی ١٩٣٤دا بلاویکردوەتەوەو هەولی ئەوەی تیا داوە ئەوەمان بۆ تێدا ڕوونبکاتەوە کە ڕەوشتی منالی ئیتالیاییە کۆچکردوەکان تا چ ڕادەیەك شێوەی خوو پێوەگیراوی ژیانی ئیتالیا ئەخاتەڕوو و ئەم ڕەوشتە تا چ ئەندازەیەك لەگەلْ شێوەی ژیانی ئەمەریکادا ئەگونجێو ، ئاخۆ ئەم منالانە لەسەر ئەم بنەڕەتە ئیتالیایین یان ئەمەریکایین . بە واتەیەکیتر ، ئەم کتێبە هەولیئەوەی ئەدا وەلامی ئەم پرسیارە بداتەوە کە : ئاخۆ ئیتالیا وەك کولتوور لەناو هەرکام لەو منالانەدا لەکوێدایەو ، ئەمەریکا لەکوێدایە .

ئەمە هەمووی بەتەواوی ئەوە ئەگەیەنێ کەوا پێگەیاندنی کۆمەلایەتی تەنها بە یەك ڕێبازدا ناڕواو ، منالیش ملکەچە بۆ گەلێ کارتێکەری ئالۆزو لقوپۆپ لێوە بوو ، بەلام هەموویان سەرەنجام یەکئەگرنەوە لە ئامادەکردنی منالەکەدا بۆ ئەوەی ببێ بە ئەندامێکی پێگەیشتوو لەگەلْ ئەندامەکانی تری کۆمەلداو ، بۆ هێنانەدیی ئەو هاوسەنگییە کە مارییا مینتسۆری باسیکرد ووتی ئەبێ لەنێوان ئازادیو پەلهاویشتنی تاکو لەنێوان سوودی کۆمەلدا بێتەدی .



هەروەها ئەوەیش ئەگەیەنێ کەوا باوكو دایك چەند بتوانن راستەوخۆ کاربکەنە سەر منالیان ، ناتوانرێ بووترێ لەتوانادایە کارێك بکرێ منالێ ببێ بە وێنەیەکی دەق باوکی یا دایکی . بۆیە پێگەیاندنی کۆمەلایەتی لەراستیدا لە دوو کرداری جیاواز پێك دێ ، بەلام هەریەك لە دوو کردارەکە ئەویتریان تەواوئەکا . یەکەمی ئەو دوو کردارە گواستنەوەی ئەو کولتوورەیە کە لەناو کۆمەلەدا فەرمانرەواو باوە بۆ منالەکەو ، دووهەمیشیان خۆگونجاندنی منالەکەیە لەگەلێ ئەو دەوروبەرو کۆمەلەو کولتوورەی تێدا ئەژی . ئەم دوو کردارە هەردوکیان بەدرێژایی ژیانی تاك بەردەوام ئەبن ، هەرچەند پێکهێنەکانیان و رەگەزەکانیان بەپێی بارو دۆخ و بەگوێرەی بەسالاچوونی مرۆو شارەزایی کۆکردنەوەی لە ژیانا ئەگۆرێن .

هیچ گومانی تێدا نی یە کەوا منالێ لە سەرەتادا سەلبی ئەبێ ، ئەگەر راست بێ بەم سیفەتەی کە باسی ئەکەین بلێین سەلبی ، واتە هەرچی کارتی کردنێکی دەرەکی هەیە کە بەردەوام و بێوەستان کاری تێئەکەن و کەسایەتیی پێکدێنن ، بەپیری هەموویانەوە ئەچێ و هەموویان وەرئەگرێ . بەلام پاش تێپەربوونی ماوەیەك وای لێ دێ شتێ لەبارەی خۆیەوە تێئەگاو ئەچێتە مێشکیەوە . یاخود بلێین خۆی ئەدۆزێتەوەو ، بەمە باشتر دەسەلاتی بەسەر ئەوەدا ئەشکێ کە بەراورد بکاو لەنێوان هەلوێست و توانا جیاجیاکانا هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریاندا هەلاوێرێ . . ئەمەیش رەگەزێکی بایەخداریتری پێکهاتنی کەسایەتیی تاك و دەربرینی جیاوازییەکانی نێوان ئەندامانی هەر کۆمەلێکە . وایش ئەبێ ئەو پێوەدانگ و سەنگ و تەرازووانەی دێنە رێی منالێ لێك جیا ئەبن ، وەك ئەوە کە لە هەرکام لە مالێ و لە قوتابخانەدا سەنگ و تەرازوویەك باو بێ جیا لە هی ئەویان . لەمەوە مندالێ گەلێ گیروگرفتی نارەحەتی دێتەرێ کە کام لەم سەنگ و تەرازووانە پەسەند بکاو کامیان بداتە دواوە . ئەم بەیەکادانی پێوەدانگ و سەنگ و تەرازووەی مالێ و قوتابخانەیە ئەبێ بەهۆی زۆربوونی تاقی کردنەوەی منالێ هەر لە سەردەمی منالییەوە ، هەرچەند گەلێ جاریش پەکی رەوتی کاری پێگەیشتنی کۆمەلایەتی ئەخا .

رەنگ بێ ئەم هەلوێستە ئەوەبێ کە منالی ئەو کۆمەلگایانەی گۆرانی گورج و لەپریان بەسەرادێ ، تووشی ئەبن وەك کۆمەلگا عەرەبییەکان کە ئەمرۆ بە

قۆناغێکدا تێئەپەڕن لە مەترسیدارترین قۆناغەکانی مێژوویانەو ، گەلێ بیرو فەلسەفەو ڕێبازی شارستانیو کولتووریی لە وڵاتی هەندەرانەوە هاتوو بەسەریا دێنو ، کولتووری کۆنو بەمیرات بۆماوەی باو باپیرانیش هێشتا زۆر کاریگەرە . منداڵیش بەهۆی ئەمەوە هەر لە سەرەتای منداڵییەوە بەرەورووی گەلێ بارو دۆخی کۆمەڵایەتییوا ئەبێتەوە لە زۆر سەرەوە دژی یەکنو بەڵکو هەر یەکیش ناکەون .

جا زۆر جار وائەبێ ئەم بارو دۆخانە بەشبەحاڵی باوكو دایکیش تازە ئەبن کە ئەرکی پێگەیاندنی منداڵەکەیانو بەڕێوەبردنی ژیانو ڕەوشتی ئەگرنە ئەستۆی خۆیان ، بەجۆرێ کە خۆیان بە بێدەسەڵات دێتە پێش چاوو نازانن باشترین ڕێگاو شێوەی یەکخستنی کولتووری چەسپاوی کۆنو کولتوورو ڕێبازی بیرو ڕەوشتی نوێی لەپڕهاتوو چۆنە ، کە ئەوان خۆیان لێی تێناگەنو پەسەندی ناکەن ، هەر هیچ نەبێ لەبەرئەوە کە بەشێك نەبوە لە پێگەیشتنی دەروونیو ئەقڵیو کۆمەڵایەتیی خۆیانو ، ڕەگەزێك نەبوە لە ڕەگەزەکانی پێگەیاندنو پەروەردەکردنو ئامادەکردنیان بۆ ژیان . . لەوانەیە هەر ئەمەش بێ هۆی ئەوە کە گەلێ لە دەروون شناسانو زانایانی کۆمەڵایەتیو ئەنترۆپۆلۆژی کە خۆیان بە لێکۆڵینەوەی بابەتەکانی منداڵو کاری پێگەیاندنی کۆمەڵایەتییەوە خەریك کردووە ، کە ڕیزی شێوە پێخوێندنە کۆنەکانی قوتابخانە سەرەتاییەکانا ئەوەستنو داکۆکیی لێ ئەکەن ، بە بیانووی ئەوەوە کە وەختی خۆی باوكو دایکی منداڵەکان کە منداڵ بوونو لە قوتابخانەدا بوون ، بەم شێوە پێیان خوێنراوەو پەروەردە کراونو . ئەگەر ئێستا منداڵەکانیشیان هەر بەم شێوە پێیان بخوێنرێ هیچ ناکۆکییەك لەنێوان کارتێکردنی ماڵو کارتێکردنی قوتابخانە لە منداڵدا نابێ ، بەڵام ئەگەر قوتابخانە گوێ بە شێوەی کۆنی باو باپیران نەداو لەسەر شێوەی پێخوێندنی نوێ بڕوا بەڕێوە کە باوکەکانی ئەمڕۆ خوویان پێوە نەگرتووە یا لێی نازانن و شارەزای نین ، ئەو ناکۆکی نەبوونە لەنێوان شێوەی پەروەرشتی ماڵو شێوەی پەروەرشتی قوتابخانەدا نایەتەدی .

ئەم قسەیەش نابێ وا لێك بدرێتەوە کە گوایە هێرشە بۆسەر شێوە پێخوێندنی نوێ ، یا تەقەلایەکە بۆ قەدرو قیمەت کەمکردنەوەی و بە بێکارە دانانی . بەڵام هەر چۆن بێ ئەمە بابەتێکە لە دەرەوەی چوارچێوەی ئەم وتارە . هەموو ئەوەی کە ئەمانەوێ دووپاتی بکەینەوە ئەوەتە کە بڵێین باشترین شێوەی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی خێزاندا ، ئەو شێوەیە کە تا لەتواندا بێ نەکێشێتەوە بۆ ئەوە کە منداڵ وا هەستبکا کە کاتێ ڕووبەڕووی هەڵوێستی کۆمەڵایەتیی جیا جیا ئەبێتەوە ، بەر هیچ جۆرە تەوژمێك ئەکەوێ ، کە ئەو تەوژمو گرژکردنەوانەش زۆر جار پاڵی پێوە ئەنێن بۆ ملپێچیکردنو لەڕێلادان .

وا باوە کەوا دایك لەئەنجامی ئەوەدا کە منداڵ لە ساڵە پێشینەکانی ژیانییدا زیاتر لە باوکی پێوەندی بەوەیەو ئەو پتر کاری تێئەکا ، دەوری سەرەکی لە پێگەیاندنیو لە کاری سروشتیکردنی کۆمەڵایەتیدا ئەگێڕێ . ئەمە بەتایبەتی لە کۆمەڵگا کۆنەکارەکانا وابوو کە ژیانو وتەقەلای ئافرەتیان تێدا تەرخان بوو بۆ کاروباری ماڵو خێزانو منداڵداریو ژن لە دەرەوەی ماڵەوە هیچ کارێکی نەئەکرد . بەڵام وادیارە ئەمڕۆ ئەم هەڵوێستە بەپەلە خەریکە ئەبگۆڕێ بەتایبەتی لە ڕۆژاوا کە ژنان ئەچنە دەر لە ماڵ بۆ کارکردنو بزووتنەوەی ڕزگاری خوازیی ژنان پەرەی سەندووەو ، لە هەموولایەکەوە دەنگ بەرز ئەبێتەوە کەوا پێویستە باوکیش لە ئەرکی پەروەردەکردنی منداڵدا بەشداراییو ئەویش هەر لە هاتنە دنیایەوە بە چاودێریکردنیەوە خەریك بێ ، لەبەرئەوە کە پەروەردەکردنی منداڵ ئەرکی سەرشانی باوکیشو دایکیشەو وەنەبێ کارێکی تایبەتیی دایك بێو پسپۆرییەك بێ ئەو نەبێ کەس نەیزانێ . بەڵام ڕاستەکەی بێ ئەم دەنگ بەرز بوونەوەیەو بێ ئەم بزووتنەوەی ڕزگاریخوازییشە ، باوك لە هەموو کۆمەڵگایەکدا دەورێکی گەورەتر لەوە ئەبینێ لە پێگەیاندنی منداڵدا هەر لە منداڵییەوە ، کە بە عادەت بە خەیاڵی خەڵکدا دێ ، هەرچەند بە حوکمی سروشتی شتەکانو بەپێی کاروباری ڕووداو ، دایك ماوەیەکی زۆرتی لە باوك لەگەڵ منداڵدا بەسەرئەباو ، هەر بەهۆی ئەوەیشەوەیە کارتێکردنی دایك لە منداڵدا لە ساڵەکانی سەرەتای تەمەنیدا ئاشکراترو قووڵترە ، وەك چۆن باوکیش لە ساڵەکانی لەوەپاشی ژیانی منداڵدا جێپەنجەی خۆی بە شەخسیەتەوە بەجێئەهێڵێ . لەمەیشەوەیە جیابوونەوەی منداڵ لە دایکی یا لێدوورخستنەوەی بەی بەتایبەتی لە پێنج ساڵی پێشووی ژیانیدا ، لای زۆرکەس بە یەکێ لە ستەمکارانەترین کردەوە دائەنرێ کە لەوانەیە ئادەمزاد لە ژیانیدا تووشی ببێ .

ڕەنگبێ هەر لەمەیشەوە بێ وا مافی دایەنیکردنی منداڵ لە ساڵە پێشینەکانی منداڵیداو تا ئەگاتە تەمەنێکی تایبەتی ، بە دایك دراوە ، چونکە ئەم پێوەندییەی



نێوان دایك و منداڵ کارێکی زۆر ئەکاتە سەر هاوسەنگیی دەروونی و کۆمەڵایەتیی منداڵ..

ڕاستە کۆمەڵگای وا هەیە منالی هەر لە منالی یەوە تیا جیا ئەکەونەوە لە دایکی و ئەیاندەن بەدەست کەسانی ترەوە لە ئەندامە نێرینەکانی کۆمەڵەکە بۆئەوەی پەروەردەیان بکەن و ئاگایان لێیان بێ و ئامادەیان بکەن بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی. وەك لە هەندێ لە کۆمەڵگا خێڵەکی یەکانی ئەفەریقا. بەتایبەتی ئەوانەیان کە لەسەر سیستێمی چینەکانی تەمەن ئەڕۆن بەڕێوە کە تاکیان بۆئەوە تێدا ئامادە ئەکرێ دەورێکی تایبەتی بگێڕێ کە کۆمەڵ بۆی دیاری ئەکا. بەڵام ئەمە بەعادەت پاش ئەوە ئەبێ کە منال قۆناغە پێشینەکانی ژیانی بەسەربەری و نزیکی باڵق بوون بووبێتەوە.

هەروەها ئەم سیستەمەیش سەرەنجام ئەوەی مەبەستە کە تاك بشێلێ بە کۆمەڵەی گەورەوە بەتێکرایی و پلەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ دیاری بکا. واتە ئەم سیستێمە ئەرکێکی تەواوکەری ئەرکی خێزان و ماڵی لەئەستۆدایە لەڕووی پێگەماندنی کۆمەڵایەتی یەوە. ئەم ئەرکەیش زیاتر لە ئەرکی قوتابخانەو مەڵبەندی مەشق پێکردن و شایانکردن ئەچێ کە لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا باوە. زیاد لەمەیش ئەم سیستێمە سەرەنجام ئەکێشێتەوە بۆ بەدیهێنانی پێوەندێکی بەربڵاوی کۆمەڵایەتی لەنێوان ئەو منداڵانەدا کە پێکەوە ئەم کردارەیان لەگەڵ ئەکرێ. بەجۆرێ کە شتێکیان لەنێواندا پەیدا ئەبێ بۆ ئەوە ئەشێ پێی بووترێ خزمایەتی کۆمەڵایەتی و ئەم خزمایەتی یە کۆمەڵایەتی یەیش هەندێ ئەرك و پێویستی وایان ئەخاتە سەرشان لەو ئەرك و پێویستی یانە ئەچێ لەنێوان خزمی ڕاستەقینەدا هەیە. ئەمەیش جۆرە پێگەیاندنێکە بەتەواوی لەگەڵ ئەو بارو دۆخەی دەوروبەرو ئەو بارو دۆخە ئابووری و دەورو بەری و کۆمەڵایەتی یەدا ئەگونجێ کە ئەو کۆمەڵەو خێڵانەی لەدەو دارستانەکانا تیا ئەژین. کە پێویستیان بە ڕادەیەکی بەرزی پشتی یەك گرتنی کۆمەڵایەتی یە. ئەم سیستێمە هیچ نەبێ تارادەیەك لەوە ئەچێ کە لەناو زۆر لەو کۆمەڵگا چاولی کەری یانەدا ڕووئەدا کە پڕن لە خێزانی گەورە گەورەی ژمارە زۆر. لەناو ئەو کۆمەڵگایانەدا منال کە دێتە دنیاوە تەماشا ئەکا خەڵکێکی زۆری پێگەیشتووی کە دێتە دنیاوە تەماشا ئەکا خەڵکێکی زۆری پێگەیشتووی باڵق بووی لە کوڕو کچ بەدەورایە کە هەموو لەو گەورەترن و هەموو پێکرا. هەریەکە بەجۆرێ. لە پێگەیاندن و ڕێ پیشاندان و پێگەیاندنی منداڵ تەنها ئەرکی سەرشانی باوك و دایك نابێ. ئەمەیش لە سەرێکەوە یارمەتیی منداڵ ئەدا کە شەخسیەتێکی ئازاد بۆخۆی پێکەوەبنێ و لە شەخسیەتی باوك و دایکی سەربەخۆ بێ. بەڵام لە سەرێکی کەیشەوە ئەم شێوە ژیانە گەلێ گیروگرفتی لێوە پەیدا ئەبێ ئەگەر منداڵەکە بکەوێتە بەر ڕێ پیشاندان و ئامۆژگاری کردنی جیاجیا لە کەسانی واوە کە هەریەکە ڕێ و شوێن و بیروباوەڕی تایبەتیی خۆی و شێوە ڕەوشتی تایبەتیی خۆی هەبێ. ئەمەیش قسەکانی پێشوومانمان دێنێتەوە یاد کە لەبارەی بەگژیەکاچوونی بیروباوەڕو بەهاو شێوە ڕەوشتی جیاجیای ناو قوتابخانەو ماڵەوە وتمان. کە چ کارێك

ئەکەنە ژیانی مندالّ .

ئەو هۆیامەی لە کاری پێگەیاندنی منالّدا دێنە ناوەوە – هەرچی بن‌و ، ئەو مەینەتانەی دێنە رێی ئەم کاری پێگەیاندنە هەرچۆن بن‌و ، زانیان هاودەنگ بن یا نە لەبارەی باشترینی ئەو رێگاو شێوانەوە کە ئەکرێ لەم مەیدانەدا پێرەوی‌یان لێ بکرێ‌و ، باری سەرنجی کۆمەڵگاکان بۆ منالّ‌و شێوەی پێگەیاندن‌و پەروەردە کردنیان‌و ئەوەی چاوەڕوانیی ئەکەن لە منالّ پاش گەورەبوونی – هەرچۆن بێ ، ئەوەی دەرئەکەوێ ئەوەتە مەسەلەکە لە جاران گەلێ ئالّۆزتر بووە .

کەم‌وائەبێ تەلەفزیۆن بەسەربەخۆو جیا لەو هۆو دەزگا رەسمی‌یانە کاربکا کە ئێستا دەورێکی بایەخدارو کاریگەر لە پێگەیاندنی مندالّدا ئەبینن‌و پێشتر مالّ‌و قوتابخانە ئەو دەورەیان ئەبینی بەلاّم ئەمرۆ کەوتووەتە ئەستۆی هۆیەکانی پێوەندی‌و راگەیاندن . تەلەفزیۆن بەتایبەتی ئێستا وانەماوە کە تەنها هۆیەکی وەخت‌بەسەربردن بێ ، بەلّکو بووە بە هۆیەکی گرنگی پێ‌خوێندن‌و پەروەردەکردن‌و رێباز بۆ دیاری‌کردن‌و ، بەهۆی ئەوەوە بووە بە ئامێرێکی کاریگەر لە مەیدانی پێ‌گەیاندن‌و سروشتی‌کردنی کۆمەلاّیەتیدا ، نەخوازەلاّ کە منالّ لە هەموو کۆمەلّگایەکدا حەزیان لێ‌یە رۆژی ماوەیەکی زۆر لەبەردەم دەزگای تەلەفزیۆندا دانیشن . بەهۆی ئەمەشەوە وایان لەهاتووە لە رەوشتی رۆژانەیاندا لاسایی ئەوشتانە ئەکەنەوە کە لە پرۆگرامە جیاجیاکاندا بەرچاویان ئەکەوێ . زۆر لە بنووس‌و خاوەن‌بیرەکان لایان‌وایە بلاّوبوونـــەوەی تـــاوانکـــردن‌و زۆربەکارهێنان‌و بەرەڵلاّیی لە کاروباری سێکسدا کە ئەمرۆ لە کۆمەلّگاکانی رۆژاواو بەتایبەتی لە ئەمەریکا بووە بە باو . ئەگەرێتەوە بۆ ئەو پرۆگرامانەی تەلەفزیۆن کە حەزیان لە دەرخستنی ئەم‌جۆرە بابەتانەیەو بەم‌دەورەدا گێژو خول ئەدەن . ئەوەی کە لێرەدا پێش لە هەرچی مەبەستمانە ئەوەتە هۆ جەماوەری‌یەکانی راگەیاندن ئەبن بە مایەی هاتنەدیی بلاّوبوونەوەو پەرەسەندنی شێوە رەوشتێکی یەکگرتوو لەناو کۆمەلّداو دەورێکیان لە لێك نزیك‌خستنەوەی رێبازو هەلّوێست‌و بەهاکانی ناو کۆمەلّدا هەیە . ئەمەیش بێ‌گومان مەسەلەیەکی بایەخدارە چونکە ئەبێ بەهۆی کەم‌بوونەوەی ناکۆکی‌و لێك‌هەلّپرژان لەناو کۆمەلّدا .

لێرەیشدا هەلّەیە لامان‌وابێ هەلّوێستی مندالّ لە بەرابەر هۆیەکانی راگەیاندندا ، بە تەلەفزیۆنیشەوە ، هەلّوێستێکی سەلبیی رووتەو ئەوانیش هەرچی‌یان بێتە بەردەم بە یەك شێوە وەری‌ئەگرن . راستەکەی ئەوەیە گوێ‌رایەلّ‌و دلّ‌پێ‌دانی مندالاّن چون‌یەك نی‌یە ، هەربۆیەیش ئەمرۆ زانایانی پەروەرُت‌و سایکۆلۆجی بایەخێکی زۆر ئەدەن بە کاری گونجانی منالاّن لەگەل ئەو پرۆگرامانەی کە پێشکەشیان ئەکرێ . هەروەك جێمس هالّورانی بەرێوەبەری مەلّبەندی پێوەندی‌یەجەماوەری‌یەکانی زانکۆی لیستەر لە ئینگلتەرە ئەلّێ : «کەم وائەبێ تەلەفزیۆن بە تەریکی لە هۆیەکانی‌تری پێوەندی کاربکا . . .

منالاّنیش سەرەرای ئەو جیاوازی‌یە بنچینەیی‌یانەی لەپێکهاتنیان هەیە ، هەریەکە لە بارو دۆخێکی تایبەتیدا پێ‌ئەگاو کەسانی جیاجیا ئەبینن‌و ، تاقی‌کردنەوەی جیاجیا وەدەست‌دێنن‌و هەلی جیاجیایان بو هەلّ‌ئەکەوێ . بۆیە کە تەلەفزیۆن ئەبینن ، بە سەنەنگ‌و تەرازووی تاقی‌کردنەوەی رابوردووی خۆیان‌و پێوەندی‌یەکانی ئێستایان‌و هیواکانی دوارۆژیان بریاری بەسەرائەدەن . لەمەوە دەرئەکەوێ کەوا مەسەلە ئەوە نی‌یە تەلەفزیۆن چی‌ئەکا بە منالاّن ، بەلّکو ئەوەیە منالّ چی‌ئەکەن بەو کەرەستەیەی تەلەفزیۆن پێشانیانی ئەدا . . (سەیری وتارەکەی هالّوران بکە کە سەسەبارەت بەوکارەی تەلەفزیۆن ئەیکاتە سەر منالّ . لە گۆڤاری «نامەی یۆنسکۆ» دا بلاّوکراوەتەوە) .

کۆمەلّی نەتەوە یەکگرتووەکان جاری‌دا کەوا سالّی ١٩٧٩ سالّی منالّە . ئەو بۆیە ئەم سالەی کرد بە سالی منالّ . هەولّی تیا بدرێ بۆ باش‌کردنی بارو دۆخی ژیانی منالاّتی جیهان . وەك لە یەکێ لەو بانگەوازانەدا وتراوە کە کۆمەلّی نەتەوە یەکگرتووەکان لەم‌بارەوە کردوویەتیە هەموو جیهان ، ئەم سالّە هەموو منالاّن ئەگرێتەوە بەلاّم لەگەلّ بایەخدانێکی تایبەتیدا – کە ئەوەیش کارێکی بێ‌جێ نی‌یە – بەو منالاّنەی کە بێ‌بەشن لە کەسێ خۆشی‌بوێن ، واتە هەتیون‌و ، لە خواردەمەنی‌و تەندروستی‌و لە شوێنێ تێیدا بحەسێنەوەو لە خوێندەواری‌یش ، چونکە لە بارو دۆخیکی‌وادا ئەژین بێ‌بەشی کردوون لەم پێویستی‌یانە ، یا بە واتەیەکی راست‌و دروست‌تر بێ‌بەشی کردوون لە بەهرە وەرگرتن لەم مافە سروشتی‌یانەی خۆیان .

لە پلانی ئەم‌سالەدا ئەوە نەبوو کە هیچ کۆنگرەیەکی نێودەولّەتانی تیا بگیرێ یا هیچ رێکخراوەیەکی نوێی تیا پێکەوە بنرێ ، بەلّکو سالّەکە سالّێ بوو لە پلەی

یەکەمدا لەسەر بناغەی ئەوە دامەزرابوو و پشتی قایم‌کردبوو کەوا هەوڵی خۆیی لەلایەن دەوڵەتانو رێکخراوەکانو کۆمەڵە زانستی‌یەکانی ولاّتانی جۆربەجۆرو ئەمو ئەوەوە تیا بدرێ بۆ کۆڵینەوە لە گیروگرفتەکانی منالاّنی هەرکام لەو دەوڵەتانەو بۆ پلاّن‌دانان بۆ پرۆژەی‌وا کە پێوەندیێ بە هێنانەدیی ئەو مەتڵەبانەوە هەبێو ، بۆمەیدان‌دان بە منالاّن کە بەهرە لە مافە سروشتی‌یەکانی خۆیان وەربگرن .

کۆمەڵی نە تەوە یەکگرتووەکان سوور بوو لەسەر ئەوە کە لە هەمان‌کات رای منالاّن خۆیشیام لەو کۆمەڵگایانەیاندا کە تیایاندا ئەژین ، پشت‌گوێ نەخرێو بۆچوونی خۆیان لەبارەی مافەکانیانو داخوازی‌یەکانیانەوە ، بزانرێ . ئەمەش شێوە کارێکی نوێ‌یە لە چارکردنی گیروگرفتەکانی منالّی‌و منالاّندا پێشان لێکۆڵەرەوەکان عادەتیان وابوو تەنها پرسیاریان لە باوکو دایکو تێکرا لە گەورەو هەرزەکاران ئەکرد چونکە ئەوان بەرپرسی پەروەردەکردنو پی‌خوێندنو پێگەیاندنو سروشتی‌کردنی منالاّنن لە رووی کۆمەلاّیەتی‌یەوە ، بێ‌ئەوەی هیچ بایەخێکی ئەوتۆ بە منالّەکە خۆی بدەن ، هەرچەند لێکۆڵینەوەکانیشیان سەبارەت بە منالّەکەیەو ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەیش کار لە ژیانی منالّەکەدا ئەکاو ، هەرچەند لەوانەیشە زانینی بیرو رای منالّەکە خۆی بێ بە کلیلی تێگەیشتنی گەلێ لەو گیروگرفتانەی گەورە لی یان حالّی نابن .

لەئاست ئەمەدا سازمانی یۆنسکۆ لیستەیەکی کورتی پرسیاری خۆش خۆش (دە پرسیار) داناو پێشنیهادی کرد کەوا بپرسرێن لە منالاّنی هەموو جیهان ، بەڵکو ئەو زانستی‌یانەی لە رێگای ئەو پرسیارانەوە دەسگیر ئەبن بکێشنەوە بۆ لی‌تی‌گەیشتنێکی قووڵتری گیرو گرفتەکانی منالّی‌و منالاّن . ئێستا بۆمان دەرئەکەوێ چۆن ئەم پرسپارانە بە دەست ئەنقەست ئەیانەوێ بیری منالّ بزوێنن کە بیر لە خۆی‌و باوکو دایکی‌و ئەو بارو دۆخە کۆمەلایەتی‌یە بکاتەوە کە لە کۆمەڵگاکەیدا باوەو مەودای ئەوەی بدا ئەو بارو دۆخە هەڵسەنگێنێ :

ئەمەش پرسیارەکان :

**١ – تۆ لەو باوەڕەدای پێویستە لەسەر باوکو دایك لەبارەی گیروگرفتەکانی ناو خێزانەوە لەگەڵ منالّەکانیان بکەونە گفتوگۆ ؟**

**٢ – منالّ ئەبێ گەیشتبێتە چ‌تەمەنێ ، تا باوکو دایك بتوانن لەبارەی گیروگرفتەکانی سێکسەوە لەگەڵی بکەونە گفتوگۆ ؟**

**٣ – منالّ بەرپرسی‌یەکی تەواوی ہێ لەئەستۆ ئەگیرێ ؟**

**٤ – تۆ بە چەشنێکی جیاواز لەوەی کە باوکو دایکت لەگەڵ خۆت جوولاّونەتەوە ، لەگەڵ منالّەکانت ئەجوولێیتەوە ؟**

**٥ – تۆ لات‌وایە ئەبێ کورو کچ بە یەك‌جۆر مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ ؟**

**٦ – تۆ ئەتەوێ بەجۆرێکی جیاواز لە ژیانی باوکو دایکت بژیت ؟**

**٧ – ئاخۆ هەمیشە گەورە مامەڵەیەکی باش‌و دادپەروەرانە لەگەڵ منالّ ئەکا ؟**

**٨ – گەورە ئەتترسێنن (واتە : لە گەورە ئەترسی ؟)**

**٩ – تۆ لات‌وایە پێویستە هەلێکی زیاتر بە منالّ بلرێ بۆ بریاردان ؟**

**١٠ – تۆ لات‌وایە گەورە ئەفامێ چۆن لەگەڵ منالّ بجوولێتەوەو چۆنی مامەڵە لەگەڵ بکا ؟**

یۆنسکۆ لە وەلاّمی ئەم پرسیارانەدا گەلێ مەعلووماتی بەتامی‌وای دەسگیر بوو کە هەندێکیان قووڵی‌و تێگەیشتن‌و گاڵتەجاری‌یەکی زۆری تێدایە کە هاتووە ئەم پرسیارانەی لە نموونەیەکی هەڵبژاردەی منالاّنی جیهان پرسیوە . بۆنموونە منالّێکی کەنەدایی لە وەلاّمی پرسیاری نۆهەمدا کە ئەڵێ : «تۆلات‌وایە پێویستە هەلێکی زیاتر بە منالّ بدرێ بۆ بریاردان ؟»

بەم‌جۆرە وەلاّمی داوەتەوە : «بەڵێ ، گەورە باوەڕیان وایە تەنها خۆیان ئەتوانن سەبارەت بە منالّ بریار بدەن ، تەنانەت لەو شوێنانەیشدا کە ئەبێ منالّەکە خۆی بریارەکە بدا ، وەك ئەوە کە وائەبێ ئەڵێن : « من سەرمامە ، بۆیە واچاترە تۆیش چاکەتەکەت لەبەربکەیت» ، بێ‌ئەوەی گوێ بەوە بدەن کە لە منالّەکە بپرسن ئاخۆ سەرمایە تی یا نە ؟ لەخۆیانەوە وای‌دائەنێن مادەم ئەوان خۆیان سەرمایەنە ، ئەبێ منالّەکەیش سەرمای بێ» . ئەم منالە کەنەدایی‌یە بەم‌جۆرەیش‌و وەلاّمی پرسیاری دەهەمی داوەتەوە کە ئەڵێ : «تۆ لات‌وایە گەورە ئەفامێ چۆن لەگەڵ منالّ بجوولێتەوەو چۆنی مامەڵە لەگەڵ بکا ؟» ،وتوویەتی : «من حەزم لێ نی‌یە یەکێکی گەورە سەرم بەسەردا شۆرکاتەوەو نقورچێ لە روومەتم بگری‌و بڵێ ئەمرۆ چۆن بوو چی رووی‌دا لە قوتابخانە ؟ تۆ لەوێ وەك منالّێکی باش‌و فامیدە جوولاّیتەوە ؟» . زۆر کەسی گەورە حەزناکەن لەگەڵ منالّ دانیشن چونکە لایان‌وایە منالّەکان هەروا زەنایەکی زۆر ئەنێنەوە ، بەلاّم بیر لەوە ناکەنەوە کە خۆیشیان کە منالّ بوون هەراو زەنایەکی زۆریان ئەنایەوە . گەورە لەوباوەڕەردان ئەوەی خۆیان ئەیکەن بایەخدارترین شتە

ئەم گێتی‌یەدا . لەوانەیە بەش‌بەحاڵی خۆیان مەسەلەکە . وابێ . بەڵام مناڵیش کە ئەیکەن بەهەراو یاری ئەکەن‌و بوڵخاخ ئەنێنەوە ، ئەوەیش بەش‌بەحاڵی ئەوان زۆر بەبایەخەو هیچی لەوە کەمترنی‌یە کە گەورەکان بۆ خۆیان ئەیکەن . لەناو گەورانا زۆر کەسی‌وا هەن نازانن چۆن قسە لەگەڵ منداڵ بکەن‌و لایان‌وایە مناڵ تەمەنیان هەرچەند لێك جیابێ‌و چ یازدە سالان بێ‌و چ پێنج سالان ،هەموو هەر چون‌یەکن .

ئەمە لەوە ئەچێ بنیادەم سەیری (بابەعەمرە) بکاو سەری لێ سوور بمێنێ ، چونکە خووی بە دیتنی کەسانی عادەتی‌یەوە گرتووە کە دوو قۆڵ‌و دوو لاق‌و قەوارەیەکی عادەتی‌یان هەیە . مناڵ لە بەر چاوی گەورەدا لەم (بابە عمرە) انە ئەچن ، بابەعەمرەیەکن پیاو پێکەنینی پێ‌یان دێ ، چونکە بچکۆلانەن . گەورە نازانن پێوەندی‌یان لەگەڵ بکەن چونکە بەتەواوی لێ‌یان نامۆن . مناڵ لە بەرچاوی ئەواندا شتێکی جیاوازو ئولفەت پێوە نەگیراوە . . شتێکە لە قولەرەش‌و هەژارە تەواو هەژارەکان ئەچێ .

کچێکی دە سالانی سویدی‌یش بەم‌جۆرە وەلامی پرسیاری حەوتەمی داوەتەوە کە ئەڵێ : « ئاخۆ هەمیشە گەورە مامەڵەیەکی باش‌و دادپەروەرانە لەگەڵ مناڵ ئەکا ؟» ، ئەڵێ : «وائەبێ دایکم کە لە ئیش ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵ بە رووی مندا هەڵئەشاخێ . من هەست‌ئەکەم کەوا بەهۆی شتێکەوە لەسەر ئیش توورەیە ، کەچی بە رووی منا هەڵئەشاخێ‌و لە من توورە ئەبێ ، لەجیاتی ئەوەی لە ئیشەکەی خۆی توورە بێ» . لە سەرێکی‌کەیشەوە کچێکی ئینگلیزی دە سالان لە وەلامی پرسیاری پێنجەمدا کە ئە لێ : «تۆ لات‌وایە ئەبێ کورو کچ بە یەك‌جۆر مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ ؟» «بەم‌جۆرە رای خۆی دەرئەبڕێ : « بەڵێ ، چونکە من حەزم لە یاری ناکەم‌و ، کە ئامێرێکی وشك‌کردنەوەی قژی بووکەشووشەم دەس‌ئەکەوێ ، حەزئەکەم سەرقاپەکەی بەرزکەمەوەو باتری‌یەکان‌و هەرچی‌یەکی لەوجۆرەی تیایە دەربێنم . من لەوباوەڕەدام کەوا تاقە جیاوازی‌یەکی راستەقینە لەنێوان کورو کچدا ئەوەیە کور لە کچ کەمتر سەنگێنن» .

.ئەم نموونانەی لەناو کۆمەڵە وەلامێکی زۆردا هەڵمان‌بژاردن کە وەلامی دەپرسیارە پێشووەکەیان پێ دراوەتەوە ، بەسن بۆ روون‌کردنەوەی ئەوە کە مناڵ چۆن بیرئەکەنەوەو چۆن سەیری گیروگرفتەکانیان‌و سەیری پایەو پلەی خۆیان لەئاست پیاواندا ئەکەن‌و چۆن حوکم بەسەر رەوشتی گەوراندا ئەدەن‌و چۆنی هەڵئەسەنگێنن !

سەیرو سەمەرە لێرەدا ئەوەیە شارەزابوون لە بیرو رای مناڵان لەوانەیە یارمەتیی گەورانیش بدا لە خۆیان بگەن‌و بە چاوی ئەو مناڵانە بۆخۆیان بروانن . لەوانەیشە وایان لێ بکا چاو بە کردارو رەفتارو رەوشتی خۆیاندا بگێڕنەوە بەرابەر بە مناڵەکانیان‌و کاری پێگەیاندنی مناڵان بە رێگەیەکدا بەرن لەگەڵ پێویستی‌یە راستەقینەکانی ئەو مناڵانەدا بگونجێ ، وەك مناڵ خۆیان ئەیانخەنە روو . کۆیکۆ ئەو مناڵە گانایی‌یە بچکۆلانە نۆ سالانە ، لە قسەکانیا کە لە سەرەتای ئەم باسەوە بلاومان کردەوە ، رای خۆی لەبارەی ئەو کۆمەڵەوە کە تیا ئەژی‌و ، باری سەرنجی سەبارەت بە خۆی‌و بە پیاوی سپی‌و ، هیواو پێویستی‌یەکانی خۆی ، بەو وشە قووڵ‌و کاریگەرانە دەربڕی . هەر ئەم هیواو پێویستی‌و ئاواتانەیشە ، رۆڵەیەکی تر لە رۆڵەکانی ئەفەریقا کە ئەحمەد موختار ئەمبۆی بەرێوەبەری گشتیی یونسکۆیە ، بە شێوەیەکی‌ترو لە رێگایەکی‌ترەوە ، بەلام بە هەمان ئامانج‌و مەبەست دەری‌ئەبڕێ‌و ، ئەوەتە بە بۆنەی ساڵی مناڵی جیهانەوە ئەڵێ :

«یەکێ لەو راستی‌یانەی هەمیشە بەسەر زمانی خەڵکەوەن‌و زۆریان ئەڵێنەوە ، ئەوەتە کە مناڵ هیوای جیهانن . . . دەسا با لە ساڵی جیهانیی مناڵان‌او ، لە هەموو ساڵێکی پاش ئەم‌ساڵەیشدا ، مناڵان بزانن ، کە ئێمەی پێگەیشتوو ، بایەخ بە بەختەوەری‌یان ئەدەین‌و بۆی تێ‌ئەکۆشین . با هەوڵ‌و تەقەلای ئەمساڵمان یاریدەدەرمان بێ کەوا باشتر لە مناڵان بگەین . . لەبیرمان بێ ، لە هەڵس‌و کەوتمانا لەگەڵ مناڵان ، کەوا ئێمەیش وەك ئەوان مناڵ بووین . هەر بەمە ئەتوانین خۆمان لەو دەردو ئازارانە دوور بگرین کەوا مناڵی زور لە وڵاتان ئەیچێژن . . من حەزئەکەم ئەگەر بمانتوانی‌بایە ، کە ساڵی جیهانیی مناڵان دوایی‌دێ بگەینە ئەو متمانەیە کەوا لەسایەی پێشکەوتنمانەوە لە باش لێ‌حاڵی‌بوونی مناڵانداو ، بە هۆی ئەو گیانی لێ‌بووردنەوە کە لە دڵی ئەواندا چاندوومانە ، گیانی برایەتی‌و یەکێتی لە جیهاندا لە جاران پتەوترو بەهێزتر بووە .

**«رۆشنبیری نوێ»**
**لە گۆڤاری (عالم الفکر)ی کووەیتی‌یەوە**
**کردوویە بە کوردی**

# واتەو وەڵینا

محمدامین (کاردۆخی)

واتەو وەڵینا ، یا (پەندی‌پێشینان) ناوی بەرهەمێکمە کە تازە دەستم بەنووسینی کردووە نزیکەی هەزار پەندی پێشینانم بەشێوەی هەورامی کۆکردووەتەوە ، بەشێوەی سۆرانیش ماناکانم لێك‌داوەتەوە ، هێندی لەو پەندە پێشینانەشم کردووە بەهۆنراوە ئەمەی خوارەوە نموونەیێکی ئەم بەرهەمەیە کە بەتەمام ئەگەر مام بەچاپی بگەیەنم .

**(واتەو وەڵینا)**

١ – وەڵینا واتەن راسا نەك جەفەنگ
( نەپالأی تەنگ ، نە یانەی بەجەنگ» .
٢ – (ئاساو) دانەو وێش بەووردی هارۆ
(چەقچەقە) باهەر سەرەو وێش مارۆ .
٣ – گۆشتەو ، رانو ، وێت برێژە ، وەرە
منەتۆ (قەسابی) هەرگیز مەبەرە .
٤ – وڵەنە ، مەی‌بەر ، بەقسێ وەشی
چ (مار) ، چ (کەمتار) ، چ (پیرە هەشێ)
٥ – (ماڵێ) یەکجار فرەن ، (سەرە) بەرکەرە
ویەردە ، ویەرد ، باسش مەکەرە
٦ – (دار) ماچۆ (پواز) گەر جەویم نەبۆ
دوژمن ، مەتاوو ، لاشەم شەق کەرۆ
٧ – دەسێو ، نەتاوی برینەش یەکسەر
ماچ‌کەردەیش ، خاسا ، بەبێ دەردیسەر
٨ – پەی (دینارێوی) گیانش مسپارۆ
جەگرد (هەورێوی) (واران) مەوارۆ
٩ – پێسەنە (توونە) ، جە (مانگەشەوێ)
گەفو ، بێ‌سەمەر ، کەرۆ (حەوحەوێ)
١٠ – دژو (دوژمەینم) هەر بە (دۆس) وانوو
دۆستو ، دۆستیشم ، هەر بە (دۆس) زانوو
١١ – مەکەرە ، قسێ ، بێ‌فکرو هۆشێ
چونکە (دیوارا) هەنێشا (گۆشێ)
١٢ – قۆزی لەم‌هاڵی ، فووش ، کەردەنە وێش
هۆشش نەمەنەن ، لاو (هێنری‌و ، پەرێش)
١٣ – (کەڵەشێر) نەوانۆ ، شەوە ، بۆ بە (رۆ)
(کوتەك) مزانۆ ، (قۆناخ) ئیناکۆ
١٤ – وێش کەردەن قەومت ، بە (لالۆ ، لالۆ)
ئێسە گەرەکشا ، زەمینت کالۆ



ئەمانە نموونەیێك بوون لەپەندی پێشینان بەشێوەی (هەورامی) کە کردبوونم بەهۆنراوە . جا بۆ ئەوەی کەزیاتر سوودبەخش بێت ، واماناکانیان بەشێوەی سۆرانی لێك ئەدەمەوە :-

١ - پێشینان وتوویانە (نەپێلاوی تەنگ ، نەماڵی بەجەنگ) واتە : پێلاوی تەنگ قاچت ئازار ئەدا ماڵش کەشەڕو ناخۆشی تیابێ دڵت عاجزو بریندار دەکات .

٢ - واتە (ئاش دەگەڕێ و چەقچەقە سەری خۆی دەشکێنێ) بەیەکێك ئەوترێ کە لەئیشوکاری یەکێکی کەدا بێ جێ خۆی تێ کوتێ و قسەی لێ بکات ئەویش گوێ نەداتێ .

٣ - (گۆشتی ڕانی خۆت ببرژێنە ، بیخۆ ، منەتی قەساب هەڵ مەگرە) واتە : تا ئەتوانی چاوت بەدەستی کەسەوە نەبێت ، خۆت ئیش بکە ، باشەغڵەتیش بیت .

٤ - (بەقسەی خۆش مار لەکون دێتەدەر) واتە : ئەگەر قسەت خۆش بێ ئەتوانی بەئاسانی ئیشوکارت جێ بەجێ کەی

٥ - (خۆت دەرکە باماڵەکەت بڕوا) چونکە پارەوماڵ دێتەوە بەڵام «گیان» ناسنرێتەوە ، سەربرا نایەتەوە .

٦ -(دار) دەڵێ ئەگەر (پوازم) لە خۆم نەبووایە (نەدەقلیشام) ، هەمیسان ووتراوە (دار) دەڵێ ئەگەر (تەور) . (کاکی لەخۆم نەبوایە نەی ئەتوانی بمبڕێتەوە .

٧ - (دەستێ نەتوانم بیبڕم ماچی دەکەم) واتە کاتێك بچۆ بەگژ دوژمنا کەبزانی بەسەریا زاڵ دەبی .

٨ - (لەهەموو هەورێ باران ناباری) ، واتە وەنیە هەموو کەسێك چاکەی لێ بوەشێتەوە .

٩ - (وەك سەگ لەمانگەشەو بوەڕێ وایە) بەیەکێك ئەوترێ کە ناوی کەسێکی گەورە بەخراپە بیات .

١٠ - دۆستی دۆستم دۆستمە ، چونکە سوودی بۆمن هەیە دوژمنی دوژمنم دۆستمە چونکە زیان بەدوژمنم دەگەینێ .

١١ - واتە لەخۆتەوە بێ بیرکردنەوە قسە مەکە چونکە دیوار مشکی هەیە مشکیش گوێ هەیە ، نەوەك ئاشکرا بێ .

١٢ - واتە : قۆزی برسی فیز ئەکات خۆی ئەنوێنێ لەکاتێك دا ئەسپێ لەباخەڵیا (سەوزەڵەگیانم) دەڵێ . . .

١٣ - لەم هۆنراوەدا دووپەندی پێشینان هەیە :- یەکەمیان دەڵێ : کەڵەشێریش نەخوێنێ شەو نامێنێ ڕۆژ دەبێتەوە ، دووەم یان دەڵێ :- کوتەك دەزانێت قۆناخ لەکوێ یە .

١٤ - بێگانەکە ، بەخاڵۆ خاڵۆ خۆی کردووە بەخزمت ، ئەیەویت بەو جۆرە بەرەبەرە زیدو ماوات لەدەست بسێنێ و بتکاتە دەرەوە ، بەفێڵو فڕ دەست لەبنی هەوانەوە دەرچێ .

# گەشتێکی کورت بە جیهانی هونەری منالاندا

عوسمان هەورامی

هەڵسەنگاندنی بەرهەمی هونەریی منالّ ، بەتایبەتی لایەنی وێنە و نیگار ، کە لەگەڵ چاوکردنەوەیا دەست پێ ئەکا ، کێشەیەکی سەختەو ، هەمەچەشن رای پەروەردەیی لەسەرە . چۆنیەتی رابەری‌و سەرپەرشتی کردنی منالّ لەم مەیدانە بەرین‌و فراوانەدا کارێکی زۆر گران‌و ئەرکێکی زۆر گرنگە .

ئەگەر هەر لە سەرەتاوە لە منالّ بگەین‌و ، ئاگاداری‌یەکی‌و راست‌و دروست‌و دەرسکراو هاوشانی بێ ، بێ گومان هونەرمەندانی بەهرەوەرو بەتوانای بێ مەرزمان دێنە کایەوە .

**جیهانێکی سەیرو سەرسورهێنەر :**

بەر لەوەی لە جیهانی پڕ لە سەمەرەی منالّ وردبینەوە ، پێویستەو ئەرکی سەرشانی لێکۆڵەران‌و پسپۆرانە ، لە خودی منالّ خۆی وردینەوە ، ئەوەتا ، ئەگەر بەچاوی وردبوونەوەو شیکردنەوەوە بروانینە هەردوو دیمەنی دیارو دەروونی منالّ ، بۆمان ئاشکرا ئەبێ کە بە هەزاران چاوئەندازی سەرنج راکێش لە توێی هەناوی هەر منالێکا ، هەندێ رووت‌و هەندێ مت‌و کپ‌و خامۆش خۆیان حەشار داوە ، جا بۆیە بۆمان هەیە بڵێین پێش ئەوەی جیهان‌و ژیانی منالّ بە سەیر بزانین ، منالّ بۆ خۆی زۆر سەیرو سەمەرەیەو بۆ خۆی لە خۆیا جیهانێکی بەرین و بێ کۆتایە ، هەر لەم روانگەیەشەوەیە زانایانی دەروونناسی بەو پەری وردبوونەوەو دیراسەی هەمە بابەت‌و هەمەرەنگەوە ، دەمێکەو بەردەوام‌و بۆ پاشەرۆژیش گەشتیان لەگەڵ هەناو و دەروونی بەربلاوی منالاّ بەردەوامە .

خۆ ئەگەر دەورو بەری منالّیش ، لەپێشەوە دایك‌وباوك «ماڵەوە» جا مامۆستایان «قوتابخانە» ، توانیان بە ناخی منالاّ بچنە خوارەوە و لەگەڵ هەست‌و هەڵس‌و کەوتیان مامەڵەبکەن ، ئەوا هەردوو لا بەختەوەرانە بەرەو تێگەیشتنی ژیانی راست وجیهانی دروست ئەڕۆن .

لە ئەنجامی ئەم تێبینی‌یانەدا بۆمان روون ئەبێتەوە کە راست‌و دروستە ، منالّ سەرچاوەیەکە فێرمان ئەکات‌و فێریشی ئەکەین ،

**ئارەزوویەکی دەروونی :**

بێ گومان منالّ پەپوولەیەکی گوڵزاری بەهاری ژینی دڵکێش‌و رەنگینەو ئەیەوێ لە نهێنی‌یەکانی ژیان‌و سروشت و ، دەور و بەری خۆی بگات ، هەروەها ئەیەوێ بە چاوی پڕ لە نهێنی بە ناخی دەروونی خۆی‌و هاوری‌و خوشك‌و براو دایك و باوك‌و مامۆستاکانیا گەشتی خۆی بکات . . لەبەر ئەمەشە وتراوە منالّ لە سروشتا بۆ خۆی هونەرمەندێکی زۆر بەسەلیقەو لێهاتووە .

کاتێکیش ئەم بەهرەیە چەکەرە ئەکات‌و پەل بلاّو ئەکاتەوە ، بواری لەبارو گونجاوی خۆی بۆ تەرخان بکرێ ،

ئەنجامێکی سەرسورهێنەری ئەبێ . . پەل‌وەشان و جوولەو بزووتنی منال ، لە خۆیا وێنەکێشانی سەرسورهێنەرە بەناو بۆشاییدا و مایەی دلخۆشی دەورو بەریەتی ، هەر کە توانیشی هەر شتێ بە دەستەوە بگرێ ، بە هەموولایەك‌و هەموو بارێکا هەلێنەسوورێنێ ، بە ناو هەوادا ، بە سەر لەشی خۆیا ، بەسەر فەرش‌و زەوی بەردەمی خۆیا ، وەك بیەوێ بە تیشکێکی نهێنی لە روالەت و رووکەش و ناوەرۆك‌و کرۆك بگات ، . . لە هەمان کاتیشا هەمە چەشن دەنگی سەیر سەیر لە زارە بچکۆلانە خرپنەکەیەوە دەرئەچن ، کە هەمە رەنگ ئاوازو سازی پڕ لە بەختەوەری ، توندو تیژی ، پەستی ، زویری دەرئەبڕن و لەم رووەشەوە جۆرەها نۆتەی مۆسیقا دا ئەرێژن ، ئیتر بەم چەشنە ئەیەوێ بەهەر جۆرێ بووە وێنەی ئارەزووەکانی دەربڕێ .

جا بۆیە ئەتوانین بۆ ئەو رایە بچین و بلێین ، کە منال هاتە سەر رووی زەوی و چاوی کردەوە ، ئەیەوێ بە هەمە رەنگ رێ‌و هۆ و دەربڕین پێویستی‌و ئارەزووی دەروون‌و گیانی خۆی دەربڕێ . . کە لەگەل تەمەنیشا تواناو هەست و لێکدانەوەو دەربڕینی بەربلاوتر بوون ، درێژە بەو دەربڕینە سەیرانەی سەردەمی سەرەتای منالی خۆی ئەدات‌و چەشنەها هۆ ئەمە ئەگەیەنێتە دەورو بەرو جیهانی خۆی . .

بەیوەندی منال بە کەلوپەلی دەوروپشتیەوە :

هەر کە منال چاوی کردەوە ، لە هەموو شتێکی دەورو پشتی خۆی ورد ئەبێتەوە و ، ئەم دیو و ئەو دیو ئەکات‌و بە هەر چوار دەوری شتە گەورەکانا هەلئەسوورێ‌و ئەیەوێ بچێتە ناو بچووکترین تا گەورەترین شتەوە . . ئیتر بەم چەشنەو هەموو رۆژێ هەر لە بەیانی‌یەوە تا ئێوارە ئەمە پیشەو کاریەتی . . ئەبینین هەر جارەی شتێکی بە دەستەوەیەو لە کونجێکا کۆمای خۆی هەلچنیوە ، . . جارێکیان خانوچکەیەکی جوانکیلانەی وەکو مالەکەی خۆیان ، یا هی دراوسێکەیان ، یان هی خزمێکی خۆیان دروست ئەکات ، هەندێ جاریش گەرەکی خۆیان – بە شەقام‌و کۆلان‌و بازارەوە – ئەنەخشێنێ . زۆر جاریش لە شتە وردەکانی بەر دەستی (وەکو پارچە کاغەزی رەنگاورەنگ و پارچە قوماشی هەمە رەنگ ، چیلکەو پەلی قەشەنگ ، گەلاو گول ، پارچە تەختە و لاستیك ، قورو تەنەکە ، قاوغە شقارتەو قوتوو . . هتد) شتی سەیرو سەمەرە دروست ئەکات . . لێرەدا کاری بووکە شووشە و یاری پلاستیك‌و جۆرەکانی تر دێتە کایەوەو پێویستە بە پێی تەمەن‌و تواناو ئارەزووی منال ، لەم یاری‌یانە بۆ منال هەلبژێررێ ، بێ گومان ئەمەش درێژە بە بەهرەو سەرنجی هورنەری منال ئەدات و لە هەمان کاتیشا زۆر هاندەر و یاریدەدەرە . . هەروەها بردنە دەرەوەی منال بۆ گەشتی خێزانی‌و دیتنی دیمەن‌و هەمەرەنگ وێنەی ژیان ، کاریگەرو بەجێ‌یە بۆ پەرەسەندنی توانای هونەری .

سەرەتای وێنەکێشانی منال

کاتێ منال سەرنجی خوشك و براکانی ئەدا ، وا قەلەم و دەفتەریان بە دەستەوەیەو خەریکی خەتکێشان و نووسینەوەو نیگارکێشانن ، بێ سێ‌و دوو ئەمیش پەلاماری قەلەمەکانیان ئەداو ئەیەوێ نیگاری جیهانی تایبەتی خۆی بکێشێ ، بەم چەشنە پەلاماری دەفتەری ئەم‌و کتێبی ئەو ئەداو ، بە قاقاو پێکەنینی قوولەوە بە راست و چەپا خەت ئەکێشێ‌و لە خۆشیانا هەلئەبەزێتەوەو دائەبەزێتەوە . . خۆ ئەگەر بێت‌و دەفتەرو قەلەم‌و بۆیەی تایبەتی بۆ تەرخان نەکرێن ، ئیتر وا هەر چاوێکی ئەکا بە هەزار ، هەر کە قەلەم ، تەباشیر ، بگرە بۆیەو خەلووزی بەر دەست کەوت ، هەرچی لەبەر دەستیا بێ وێنەیەکی لەسەر ئەکات‌و بە هەموو لایەکا خەت ئەکێشێ ، بەم جۆرە لە ماوەیەکی کەما دارو بەردو دەرگا و پەنجەرەی مالەوە ئەکات بە پیشانگەیەکی زۆر سەیر .

جا بۆ ئەوەی ئەم ئارەزووەی سەرکوت نەکرێ و بەهرەی پیرۆزی زیندە بەچال نەکرێ ، زۆر پێویستە قەلەم‌و بۆیەو دەفتەرو کاغەز ، لە جانتا ، یا شوێنێکی تایبەتی خۆیا بۆ بپارێزرێن‌و هەرکاتێ ویستی با بەکاریان بهێنێ ، بەم چەشنە گەشە بە هونەرەکەی ئەکرێ‌و لە هەمان کاتیشا خاوێنی دەورو بەری ئەپارێزێ .

بابەتەکانی نیگارکێشانی منال :

هەزار حەیف‌و داد بۆ ئەو پشتاو پشتانەی لەمەوبەر ، کە لەم بەهرە شیرینەی ئەم سەردەمە بێ‌بەش بوون . . ئەوە بوو رژێم‌و دەستووری پەروەردەیی سەردەمانی لەمەوبەر ، بەو رۆتینە وشك و برنگەی بەسەریا سەپێنرابوو گوزەری ئەکردو بە هیچ بارێکا ئاوڕ لە هیچ بەهرەیەکی هونەری نەئەدرایەوە ، لە ئەنجاماو بەر لە سەردەرهێنان زوربەی ئەو هەموو تۆوە رەسەنانە پووکێنرانەوە ، پووچێنرانەوە و بۆ هەزاران جار بە پالەپەستۆ بە هەتیتەی ئەشکەنجەدا ، داهێزران‌و سەرکوت کران .

ئەوە بوو لەسەردەمانی رابوردوودا ، هیچ بوار نەئەدرا بە منال پەنجە بەرێ بۆ

نیگارکێشان ، بگرە لە هەندێ بارو دۆخا ئەم هەنگاوە دوا ئەخرا بۆ پلەی هەورازتر ، بە واتایەکی کە بۆ پۆلی چوارەمو بەرەو ژوورتر . . مامۆستای هونەری دوور لە هونەرو ، دارنراو لە هەموو واتایەکی هونەر ، شتێکی بۆ منالْ دەسنیشان ئەکرد ، هەر شتێك بوایە ، ئەیوت : (ئادەی ، رێك وپێك و بێ کەمو کووری نیگاری بکێشن . .) یا بۆ خۆی نیگارێکی رەنگاورەنگی ئەکێشاو فەرمانی ئەدا : [ئادەی ئێوەش وەکو ئەوەی – من – نیگار بکێشن .] . لەهەردوو بابەت و بارەکەدا ئۆف‌ودادو ، وەی بۆ ئەو منالە قوڕ بەسەرەی وێنەکەی دەرنەکردایە ! . . جێی داخێکی قووڵو کاریگەرە ، کە تا ئێستاش لە زوربەی زۆری قوتابخانەکانمانا ئەم (پەیرەوی‌یە پواوە) باوەو نەك هەر پەیرەوی بچووکترین نرخی هونەر ناکرێ ، بەڵکو هونەر هەر بەهیچ و پووچ وبارێکی گرانو رەزا قورس ئەزانن . . . ناشکرێ بڵێین هەر ئەوەندەی لێ ئەزانن و ئەمەندەی بۆ چوون ، بەڵکو ئەبێ هەمیشەو هەردەم پەیوەندیی هونەری لەگەڵیانا هەبێو رێنمایی بەردەوام بێ ، کادری هونەری پەیدابکرێ و لە هەمە چەشن خولو دەورەی هونەریدا هاوبەشی بکات ، تا ئەمە خوایە بە زووترین کات نرخی تەواوی گونجاو بدرێ بە هونەر ، ئەو هونەرەی ئاوێتەی ژیانە . . ژیانی رۆژانەی منالْ ، لە خەوهەستان ، دەستو دەمو روومەت شۆرین ، نان خواردن ، ماڵەوە ، گەرەكو دراوسێ ، رێگای قوتابخانەو سەرنجەکانی ، پەیوەندیی بە هاورێو پۆلو قوتابخانەوە ، سەرنجی باخچەو دەورو بەر ، یاری‌یە پوختە جۆراو جۆرەکان ، هۆنراوەو چیرۆکی پەروەردەیی خۆش‌و کورت شادی‌و شیوەن . . ئەمانەو زۆرتریش بابەتی زۆر لەبارن بۆ نیگارکێشانی منالو بە گیانێکی پڕ لە خۆشی‌و شادی‌یەوە ، وەریان ئەگرێ و لەگەڵیانا ئەژیو چێژێکی زۆر قوولْ بە هەستی منالْ ئەبەخشن .

نابێ ئەوەش لە یاد بکەین ، هەر کە منالْ ویستی بە خواست و ئارەزووی خۆی بابەت هەڵبژێرێ و نیگار بکێشێ ، با بیکێشێو ناکرێ رێی لێ بگرین .

ئەبێ ئازادی بدەین بە منالْ :

ئێمە لە ژیانی رۆژانەی خۆمانا ، چەندان هەڵوێستو هەڵس‌و کەوت‌و کارمان لەبەردایە ، کەسیشمان نی‌یە پێی خۆش بێو بوار بدات هیچ کەسێ خۆی لە کارو بارو راو نیازی تایبەتیدا هەڵقورتێنێ ، خۆ ئەگەر ئەمە روو بدات بەوپەڕی تواناوە بەرەنگاری‌و بێزاریمان دەرئەبڕین ، سەبارەت بە منالیش بابەتەکە هەر هەمان بابەت وکێشەیە ، بگرە لەبەر ئەوەی منالْ ناتوانێ زۆرتر بە وتەو ، زارە تەشمیلەکەی پەستی‌و پرۆتستۆو بێزاریی خۆی دەربڕێ ، لە ناخ و دەروونا گەلێ پەستتر و دژوارترە . . بۆیە دوورنی‌یە ئەگەر دەستکاری کردنو لاقەکردنی وێنەو بەرهەمی منالْ دووبارەبێتەوە ، ئەنجامی ناهەموارە ، منالْ سارد ئەبێتەوە ، ئەستێرەیەك کزئەکرێ . . بەم چەشنە ئەم وێنەیە دێتە پێش چاومان : ئەگەر لە هەموو لایەکەوە سەرچاوەیەکی بچکۆلە نوێلکاری‌و پیککاری و پاچکاری بکرێ ، پاش ماوەیەك ئاوەکە رۆ ئەچێ و لە ناخی زەویدا ون ئەبێ . . جا ئەگەر وەك سەرچاوە ، کە لەسەرچاوەوە پاك ئەکرێتەوەو ، ئاوەڕۆگەی خاوێن بکرێ ، ئاوەکەی لە زۆربوون و تەوژمی بەردەوامایە ، منالیش لە هەمانڕوانگەوە مامەڵەی لەگەلا بکرێ ، هەمیشە بەرهەمەکەی سەرچاوەیەکی هەمیشە تەقیو ئەبێ .

سەبارەت بە منالیش و گەورەش ، لێرەدا جێی خۆیەتی بڵێین لە بوارو مەیدانی ئازادیدا بەهرەی رەسەن هەزاران بەهرەی گەش و پرشنگداری لێ ئەبێتەوە ، هەر بەهرەیەکیش لەرادەبەدەر نامەی پڕ لە پیرۆزیی هونەر ئەگەیەنێو پتر گەشە ئەکات . .

**هەڵسەنگاندنی بەرهەمی منالْ :**

گەلێ راست‌و دروستە ، کە وتراوە دەردەدار بە دەرد ئەزانێ . . لەمەوبەر هەر بەش‌و پارچەیەکی وانەی هونەر بە دەست مامۆستایەکەوە بوو ، بەم چەشنە مامۆستای تایبەتی تەرخان نەئەکرا بۆ ئەم وانە پیرۆزە تا بتوانێ زنجیرەی سەرەتاو کۆتایی ئەم بەهرە رەنگینە پێکەوە ببەستێ . . بە دەگمەنیش رێك‌کەوتووە یەك مامۆستا ئەم وانەی هونەرە لە دوو پۆلو سێ پۆلا بڵێتەوە ، ئەمەیان لە سەرێکەوە ، لە سەرێکی کەشەوە تا مامۆستایەك وانەکەی تەرخان کردووە بۆ مەبەست ، بە دەیان مامۆستای تر ئەم وانەیەیان بە دەرفەت زانیوە بۆ حەسانەوەی خۆیانو سەرکوتکردن و کپکردنی منالەکان . . سەبارەت بەو مامۆستایەش وانەکەی وتبێتەوە ، کە هاتۆتە سەر هەڵسەنگاندنی بەرهەمی منالەکان ، پاندانێکی زەردو سوور ، مەرەکەب پیرۆزەیی ، یاسووری دەرهێناوە و مەچەکی لێ‌هەڵمالیوە و دارە بۆریش بە دەستی چەپەوە ، ئەوەی بەرهەمەکەی بە دڵی مامۆستایەو ، با بۆیشیان کردبێ ئەوە دە لە دە ، ئەویشی بە دڵی نەبووە ، پاش خەتێکی راست‌و چەپێ پڕ لە رق‌و کینە

به سەر لاپەڕە نازدارەکەیا ، چوار ، پێنج داری مزریشی تیّ سرەواندووە . . بەم چەشنە کە مامۆستا چووەتە ژوورەوە ، هونەر لە کە ﷲو دەروونو پەنجەو چاوی منالاّ هەلاّتووەو هەرگیزاو هەرگیز نەگەڕاوەتەوەو بۆ هەتا هەتایە تەرە بووە .

لەسەرەتای ئەم خاڵەوە تا ئەم عاستە ، بە داخەوە ، تا ئەم ڕۆش لە زوربەی زۆری قوتابخانەکانمانا دووبارە ئەبێتەوە و کسپە لە ناخ هەڵئەسێنیّ .

جا بۆ هەڵسەنگاندنی بەرهەمی هونەری منالّ دەوروخولی مامۆستای هونەر – تا کۆتایی پۆلی سێیەم – تەنیا هاندانو ئافەرین لیّ کردنە ، لەوەو بەرەوژوورتر ، بە نەرمیو تێکەلّ بە ئافەرینی گەرمو هەر بژی ، ڕێنمایی کردنی دروستکەرو پتەوی مامۆستا ، خولی باشو بەکەڵکی خۆی ئەبینیّ . . بەم چەشنە هێزو توانای باوەڕ بە خۆکردن لە دەروون و هەناوی منالاّ ئەچێنریّو ، بیرایبیر ناپاڕێتەوە و پەنا ناباتە بەر هیچ کەسیّ نیگارو نەخشی بۆ بکێشیّ .

بۆ تۆمارکردنی تێبینیش لە دەفتەری هونەری منالاّ ، تەنیا لە دیوی دووەمی لاپەڕەکەدا ، واتە لە پشت نیگارەکەوە ، (تەنیا لەسەر یەك ڕووی پەڕە قوتابی نیگارئەکێشیّ) بە هێواشیو ئەسپایی ، بەو چەشنە کار نەکاتە سەر وێنەکە ، مامۆستا بەرواری ڕۆژ تۆمار ئەکات ، ئیتر نە نمرەو پلەو نە هیچی تر .

**هەندیّ چیرۆك لە وێنەی منالاّ :**

ژیانی مرۆڤ سەراپا چیرۆکێکی شانۆیی یەو ، گەورەترین خولی پاڵەوانێتی ، خودی هەریەکە بۆ خۆی ئەبینیّ . . سەردەمی منالّیش خۆشترینو قەشەنگترین هەنگاوی ئەم شانوگەری یە سەیرەیە ، کە پڕە لە خەونی سەوزو ئالّ ، پڕە لە شیرینترین سەردەمی جیهانی منالّ . .

سەرەتای ژیانی منالّ پڕە لە سەرنج و تۆمارکردن ، لەم سەردەمەدا هەروەکو تۆمارێکی ئەلکترۆنی هەموو شتێك وەرئەگریّو موگناتیس ئاسا بە هەمووشتێکا ئەنووسیّو ئاوێتەی ژیان ئەبیّ و ئەبن بە یەك پارچەی لێك دانەبڕاو ، بەم چەشنە چیرۆکی ژیان لە بەرهەمی منالاّ هەمیشەیی و نەپچڕاوە .

باوکێکی هونەرمەند گێڕایەوە ، وتی ، منالّەکەم ، کە تەمەنی سیّ سالّ و نیوە ، خەریکی یاریکردن بوو بە پەڕەکاغەزو قەلەمێك ، لە پڕێکا وتی : ئەها بابە ، وێنەی تۆ و دایکم کێشاوە .

کاتیّ سەرنجم دا ، دیم بە هەموو لایەکا کۆمەلیّ هێلّی هەمە جۆری کێشابوو ، منیش زۆر ئافەرینم کردو ئەم لاو ئەو لایم ماچ کرد . . پاشان کوتوپڕ و بە قایم تووکی قەلّەمەکەی کێشا بە ناوەڕاستی (وێنەکەیا) . . کە هۆی ئەمەم لیّ پرسی ، لە وەلاّما وتی : ئاخر تۆ هەموو جاریّ کە تووڕە ئەبی بە توندی ئەکێشی بە ناوەڕاستی مێزەکەدا .

**منالّێکی کەش لە باخچەی ساوایانا سەیری هێلّە جۆراو جۆرەکانی ئەکاتو ئەلّیّ :**

ئەمە وێنەی ئەو شتانەیە ئەم بەیانی یە لە ڕیّ باخچەدا دیومن . . پەنجە نەرمۆلّە زیکەلەکانی بەسەر هێلّەکانا ئەبات و هەر هێلّەی ناوێکی لیّ ئەنیّو بەشان و بالّیا هەلّئەدا .

**لە باخچەیەکی تری ساوایانا ، کۆمەلیّ منالّ بە ئازادی و ئارەزووی خۆیان بە ڕاستو چەپا بە فلچەو بۆیەی هەمە ڕەنگی پەلکە زێڕینە ئاسا هەلّئەسووڕێنو بە خەندەوە ئەلّێن : بە هەرەوەز وێنەی هەرەوەز ئەنەخشێنین .**

بەڕاستی ئەم بوارە بەریە ناسکەی باخچەکانا ، مرۆڤ خۆی لە بیر ئەچێتەوە و هەزارو یەك خۆزگەیان پیّ ئەخوازیّو ئۆخەی ئەکا بۆ ئەم دەرفەتو سەردەمەی بۆ منالّی ئەم ڕۆ هاتۆتەکایەوە ، کە بیگومان هونەرمەندی دیاری دوارۆژێکی پرشنگدارترە .

لە هەمان کاتیشا کسپەیەکیش ئەنیشێتە ناخ بۆ بە باچوونی هەزاران بوارو دەرفەتی لە کیس چووی لەمەوبەر .

**قوتابی یەکی پۆلی یەکەمی سەرەتاییش سەرنجێکی وێنەکەی ئەدات و چیرۆکی گەشتی هاوین ئەکا ، بەناو ئاو و هەواو باخ و ڕەزی هاوینە هەوارە نازدارەکانمانا .**

**کیژۆلەیەکی کەش زەماوەنو شایی بووكگواستنەوەی گەرەکی خۆیان ، لە گوندەکەی خۆیانا ئەکێشیّو ئەداتە قاقای پێکەنین و ئەلّیّ : ئەها نوقلّ و چکلێت بە سەر بووکێدا هەلّئەدەن .**

**بەم چەشنە و لەم جۆرە چیرۆکانە ، هەموو هەناسەیەك لە ناخی منالّەوە سەر هەلّئەدەنو بە شێوەیەکی ڕاست و دروست پەیوەندیی نێوان سروشتو دەورو بەرو دەروونی منالّ دەرئەخەن .**

**بیّ گومان ئەگەر منالّەکانی ئێمەش لەم بەهرە زیندووەدا ئاگاداری و سەرپەرشتی یان هەبیّو تازەترین شێوەی سەروکاریی دروست و ڕاست بالّ بکێشیّ بە سەریانا ، لە دوارۆژێکی نزیکا هەر منالّەی ئەبێتە خاوەنی قوتابخانەیەکی هونەری تایبەتی خۆیو هونەرمەندەکانمان لەگەلّ کاروانی بیّ بەرو دوای بەهرەمەندانی جیهانا گوزەر ئەکەن . . لە کۆتاییدا ئەلّێم کە ئەم باسە دەربارەی کێشەیەکی گەورەو گرنگ و چارەسەرکردنیەتی ، لە هەمان کاتیشا دەرگا والاّ ئەکاتەوە بۆ درێژە پێدان و توێژینەوە و دیراسەکردنی لەلایەن پسپۆڕانەوە .**

# سادە و بەسودترین رێژیمی خوراك بۆ لاوازی ..

دوکتور نافع ایوب ئاکرەیی

«٢٥» ئامۆژگاری پزیشکی له
بابەت خواردن . . . ؟
«لە کاتی خواردن زۆر پرسیار دێنە
بەرچاو کە لەم گفت و گۆیەدا
پەرسڤیان دەبیننەوە .»
«ئەم پرسیارانە لە دکتور «مورتن
گلێم» (Mortin Glem) کارشناسی ،
خواردەمەنی ناسراوی بێ هاوتای
ئەمریکایی کراون کە وەرام و پەرسڤی
هەمو پرسیارەکان بە چاکی دایتەوە و
سودی هەمومانی تێدایە . .»

پ (١) : بۆ بە بێ ئەوەی مروڤ
هەست بە برسیەتی بکا هیندەك کەس
حەز لە خواردنی خوش و شتی تر
دەکا . . . ؟

و : چونکە زور خورەکان لە بەر
گەلەك خواردنیان . . «کالری» تەواو بۆ
دەرێنخستنی هێز و توانای مروڤ بە
چەند نائێنن بەهۆی نەجوینەوەهەر وەها
قوتدان . . . ئەمەیە دەبێتە هوی ئەوە
کە ئەوانە هەر کاتی زور بخون . . هەر
لەو کاتەدا تێرو ئەسەلو ئارامن . . .
چاکترین رێگا بۆ رێکخستنی خوراك
کە ئەشیر لە سەر گیانی مروڤ بە

نێگێتیڤی نەکا ئەوە کە کاتی خواردن بە سەر سێ جەمدا دابەش بکرێت .

پ [٢] : ئەری بەروژیبون . . سودی هەیە بۆ لاوازبونی بە پەلە . . . ؟

و : لە راستیدا وایە . . . بەلام لەشی مروف ئەگەر فێری نیزا مو ریکخستنەك بۆ و لە هیکرا ئەم نیزامە تێکبدرێت . . . دەبێتە هوی پەیدابونی مەردودەکی عەکسی بە سەر لەشی مروفدا ، چونکە کەمکردنی «کالری»کار لە گەرمی و هێزی مروف دەکا ، دیسان گورانی کاتی خواردن نیزام و رێکخستنەکانی لەشی مروف تێكدەدا و دەزگای هەزمی مروف توشی هنیدەك بارو زروف تایبەتی دەکا کە فێری نەبوە ، ئەو ژی زیادبونی ماوەی بەینی جەمەکانی نان خواردنە و ئەمە ژی دەبێتە هوی گەلەك گیر و گرفت لەم دەزگایەدا .

پ [٣] : ئەری ئەتوانرێ «کالوری» لەش لە خواردنی بێنان تەئمین بکرێت . . ؟

و : من لە گەل ئەوەدام کە پێنج شەش پارو نان بخورێ لە روژێکدا چونکە من دژی ئەم پەیڤەم کە نان بە تەواوی لادەدا لە خوراك . .

نان بناغەی کاربوهێدارتە . . کاربوهێدرات ژی سەروچاوەی دروستکردنی هێز و ئێنرژی و «کالوری» مروڤن زیاتر لەوە ژی هینەدك جوری گرینگی ڤیتامینات ژی لە ناو ناندا هەن کە پێویستمان پێیەبە . . ؟

پ [٤] : رای ئەنگو چیە بە «شیر» پێویستە یانە . . ؟

و : بروام وایە ئەبێ بلێم . . . خواردنەوەی شیر شتێکی زەروری و پێویستە و زور سودی هەیە . . ئەگەر یەك گلاسی شیر هەمو روژ بخورێتەوە . . شیر تەژی پروتین و کالسیوم و وخویەکانی مەعدەنی و ڤیتامینی جورا و جورە . . . زیاتر لەوە شیر یارمەتیەکی چاکی دەدا بو دورکردنەوەی برسیەتی لە کاتی رێژیم گرتنی لاوازی . . . بێگومان لەو کاتانەدا واتە کاتی گرتنی رێژیمی لاوازی ئەبێ ئەو شیرە بخورێتەوە کە چەوری تێدا نەبێ . . !

پ [٥] : ئەری راستە کە کالریەکانی هێز و گەرمی لە گوشتی مەروگا دا زیاتر هەن بەرامبەر بە گوشتی ماسی . . . ؟

و : لە «٥٠٠» گرامی گوشتی ماسیدا زیاتر لە ١٥ غم پروتین نیە . . . لە ناو نیو کیلو گوشتی گا ژی دا هەر ئەم هێندە پروتینە بە دەست دەکەوێ بەلام هەر لەو گوشتە ماسیەی گوتمان «٤٠٠» کالری»لێ دەردەچێ بەلام لەو گوشتە گایەی گوتمان «٥٠٠»کالوری» لێ دەردەچێ . . !

پ [٦] : ئەری لادان و نەخواردنی چەوری لە رێژیمی لاوازیدا پێویست و بێزەرەرە یان نە . . ؟

و : لە هەمو جوری رێژیمی لاوازیدا باشترە لە گەل خواردندا هنیدە چەوری بخورێ – لە سەر رای پزیشك– چونکە چەوری ژی خاوەن گرینگەکی تایبەتیە لە کارەکانی پێویستی لەشی مروف بەلام ئەبێ نیوشك «کەرە» و رونی داغکرای نەبێ ئەم چەوریە . !

پ [٧] : ئەری لە درێژی روژەکانی رێژیم گرتندا ئەتوانرێ مەی «مشروب» بە هەموو جورەکانیەوە بخورێتەوە . . ؟

و : بەرای من چاکترە کە جیکای خواردن بە مەی پرنەکرێن چونکە زەرەری بە تەندروستی مروف دەگەینێ .

پ [٨] : لە روژەکانی رێژیمدا ئەبێ چی قەدەر ئاو بخورێتەوە . . ؟

و : هەز چەند دلتان دەوێ ئەو هێندە ئاو بخونەوە ، چونکە لەش و دەزگایەکانی مروف خاوەن موعادەلەیەکی پتەوی کەمیەی ئاون . . . ئەو موعادەلەیە یەکسانە لە بەینی ئەو ئاوەی دەخورێتەوە و ئەو ئاوەی لە گیانی مروف دەردەچێ .

پ [٩] : ئەری ئەتوانرێ خوێ لە خواردن لابدرێ . . ؟

و : بێگومان نە . . ! چونکە خوێ تا رادەیەکی زور بۆ گیانی مروف گەلەك زەروری و پێویستە .

پ [١٠] : ئەری لە رێژیمدا ئەگەر پروتین وەرنەگیرێ و نەخورێ ، ئەتوانێ مروف بەپەلە لاواز بێ . . ؟

و : لە هەر کاتێ لەشی مروف «کالری» کەمتر لە پێویستیەکانی پێ بگا بە تەدریجی لاواز دەبێ . . ئەم «کالریانە» ژی مروف لەم شتانە وەردەگرێ و دەردێخێ : پروتین و کاربوهێدرات ، چەوری ، مەی و مەشروبات ، لە بەر ئەم چەندە رێژیمی خواردن پەیوەندی بە میقداری ئەم خواردنانەی هەیە و . . دیسان پەیوەندی بە سەرف و بە کارهێنانی «کالوری» وە هەیە لە ئەنجامی کارەکانی بەدەنی و فیکری و فیزیکی لە سەر ئەم بناغەیە چاکترین رێژیم ئەوە کە لەرێ تەندروستی لانەدا و بەپێی ئاموژگاری پزیشك بەرێوە بچێ .

پ [١١] : ئەری رێگا دەدری لە رێژیم گرتندا کە سەوزە بخورێت . . ؟

و : بەرای من چاکترین رێژیم

ئەوە کە موعادەلە و یەکسانیەك پەیدا بکە لە کەمکردنی هەمە جورەکانی خواردەمەنی چونکە وابزانم هیچ خواردنەك نیە سەوزی تێدانەبێ .

پ(١٢) : ئەرێ ئەو دەرمانانەی ئیشتهای خواردن دەبەن و کەم دەکەنەوە را دەدرێن ئەو مروڤەی رێژم‌دەکا بیخوا . . ؟

و : زور لەو کەسانەی رێژم دەگرن دەرمانەکانی ئیشتها بەر وەردەگرن . . بەلام ئەبێ بزانرێت کە کاری ئەم دەرمانانە زیاتر لە وەی ئیشتها ناهێلێ . خەو دەبا و کەمی دەکاتەوە و مروڤ بێ هێزدەکا و پالەپەستوی خوین بەرر ئەکاتەوە و ترپەی دل‌توندو زیاددەکا . . . لە بەر ئەم چەندە بەگشتی ئەو کەسەی ئەم جورە دەرمانانە بە کار دینێ خوی‌توشی بێ‌هێزی لەش ئەکاو تەندروستی خوی دێختە ناو خەتەردا . . . لێرەدا بەرای من لەم جورە کاتانەدا ئەبێ رای پزیشکی چارەسەرکەر وەربگیرێ . . چونکە بۆ من دروست نیە بە پیی تاق‌کردنەوەکانی من ئاموژگاریتان پیێ بدەم چونکە ئەو شتەی گوتم ئاشکرایە .

پ(١٣) : چون بزانم سەنگینی و کێشی من ئاسایی‌یە . . ؟

و : جەدەولێك هەیە ئەتوانرێ بە چاکی ئەو شتە رۆن بکاتەوە دیسان مروڤ ئەتوانێ قەوارە و قەلەوی و درێژی سینگ وناوشان و دەست و ئەنگوستەکانی خوی بەرامبەر خەلکی‌تر رابگری و بزانی کێش و سەنگینی ئاسایی‌یە یان نە . . دیسان موحیطی ئەنگوستی دووەم ئەگەر لە ٥ر٢سم مەزنتر بێ مروڤەکە قەلەوە و نیسبەتێکی‌تر ژی هەیە کە درێژی مروڤ سەد سانتیمێتر لێ بروات ئەو درێژەی دەمێنێتەوە بەرامبەر کێش و سەنگینی مروڤی بالیغە . . پێنج کیلو زیاد یان ژی کەم ئەم سەنگینی‌یە ئاسایی‌یە .

پ(١٤) : ئەرێ قەلەوی پەیوەندی بە قنێتەوە «وراثە» هەیە . . ؟

و : بەرای هنیدەك پزیشکان قنێت نەقشەکی کاریگەری هەیە لە قەلەوی مروڤ‌دا . . . بەلام من بروام بەم شتە نیە . . ! لەو حالەتانەی من دیراسەتم کردون هیچ یەکەکیان پەیوندی بە قنیتەوە نەبوە . . هەمویان پەیوەندی لەگەل عادەت و نەریتەکانی خواردن و زور خوری وکەم لڤلڤینەوە هەبوە .

پ(١٥) : ئەرێ بو لاوازی ژیملاستیك پێویستە . . ؟

و : ژیملاستیك لە رێژیی لاوازی‌دا سودی هەیە . . چونکە هەمو لڤلڤین و جولانەوەیەکی گیانی مروڤ سوتان و ئاڤاکردنی نوێ لە ناو لەشی مروڤ‌دا و ئاڤاکردنی سیلیولەکانی مروڤ‌دا پەیدا دەکا و تەندروستی ئەم مروڤە رادەگرێ .

پ(١٦) : بۆ لە سەرەتای دەست پی‌کردنی رێژم گرتن . . مروڤ زور سەنگینی خوی لە دەست دەدا . . ؟

و : زور جار وایە . . مروڤ لە هەفتەی یەکەم‌دا زور لە سەنگینی خوی لە دەست‌دەدا . . چونکە بەگۆرانی ناکاوی نەریتەکان و عاداتی خواردن . . دەزگایەکانی لەشی مروڤ زور خوێ لە دەست دەدەن کە لە ئەنجام‌دا کەمیەکی زوری ئاوی لەش کەم دەبێ و لە دەست دەچێ . . ڤیجا سەنگینی لە دەست‌دەدا .

پ(١٧) : رێگای کەمکردنی سەنگینی لەش چونە . . ؟

و : کەمکردنی سەنگینی جیاوازی هەیە بە پیی ئەو رێژم و رێگایانە مروڤ پێدا دەچێ تا سەنگینی خوی کەمکاتەوە دیسان پەیوەندی بە حالەت وەزعی خوشی و نەخوشی گیانی مروڤەوە هەیە . . . هەر وەها پەیوەندی بە ماوەی رێژمەوە ژی هەیە . . زور کەس لە هەفتەی سیەمی رێژم‌دا موعادەلە و یەکسانیەك پەیدادەکەن لە بەینی ئەو ئاوەی دەخورێتەوە و ئەو ئاوەی لە لەش دەردەچێ . . ئەم هەفتەیە ژی بەناوی هەفتەی لەبیرچون یان بە جی‌هیشتنی رێژم لە قەلەم دەدرێ . . چونکە زور کەس لەم هەفتەیەدا رێژیی خویان بە جێ دێلن . . بەلام ئەوانەی رێژیی خویان ناهێلن لاوازیان دەست پی‌دەکا و بەم وێنەیە . ئەنجامی کارەکە بەدەستەوە دێت .

پ(١٨) : بە درێژایی رۆژ زۆر حەز لە خواردن دەکەم ، بەلاّم ژان دەگرم . . ئەرێ هیچ چارەیەك هەیە . . ؟

و : یەکەم شت بۆ تەحدیدی حەزی خواردن ئەوە کە خواردن بە سێ جەمە بخورێ لە سەر رێکخستنەکی تەواوی کات چونکە ئەم مەسەلەیە کاریگەرە ، دووەم شت ئەوە ئەگەر هەست بە حەز کردنی خواردن‌کرد و زور برسی بو هیندەك کەرەفس و گێزەر یان سەوزەی کولای بخوا ، سیەم شت لە ساعەت چواری ئێوارە هیندەك سەلاتە و میوە لە گەل گلاسێکی شیری بێ چەوری بخواتەوە .

پ(١٩) : لە کاتی دانیشتن لە مێوانداری دۆستان‌دا بۆ ئەوەی یاسای

ڕێژیم نەشکێ ئەبێ چی بکرێ . . ؟
و : بەرای من خواردنی ئاسایی دو جورە ئەگەر بریارتدا ڕێژیم بگری ووخوت لاواز بکەی بە بێ هیچ تێبینیەك ئەبێ خوت لە خواردنی جوری دوەم دورکەیەوە و لە سەر ڕێگای ڕێژیم و خواردنی تایبەتی بروی و چەوری ئاژەلی و شیرینی و پلاو خواردن دورکەیەوە بەلام چونکە پروتینات و میوە و سەوزی لە ئەندامەکانی گرنگی خواردنی مروڤن و ئەتوانرێ بە جور و حەددێکی مەعقول و موعتەدیل بخورێن و بە کاربهێنرێت .
پ[٢٠] : لە کاتی روژ و گرتن و لە بێکاریدا ئەتوانم ڕێژیی خوم بگرم بەلام لە کاتی میوانی و دانیشتنی برادەران زۆر زەحمەتە . . لەم حالەتانەدا ئەبێ چی بکەم تا حەزی خواردەمەنی خوم کەم کەمەوە . . ؟
و : تەنها قەلەکی میوە بخو و یەك گلاسی شیری بێ چەوری بخۆوە . . ئەگەر ئەم شیرە لە گەل قەهوە تێکهەل بکرێت و چەند ژمارەیەك لە توی فرەنگی یان ترێ لە ناو بکرێت و چەند پارچە بەفریش لەناو بکرێت . . خواردنەوەیەکی چاکی لێ دروست دەبێ کە حەز لێکردنی خواردن کەم دەکاتەوە . . !
پ[٢١] : ئەرێ چایی وقاوە زۆر خوارنەوە ڕێگا دەدرێت . . ؟
و : بۆ ئەوانە ڕێژیم دەگرن ، خواردنەوەی ئەم دوو شتە سوودی

هەیە . . من هەمو جار بە موراجیعەکانم دەلێم : زور چای بخونەوە . . دیسان خواردنەوەی قەهوەی رەش و تال تا مەرزی پێویستی پێیان دەلێم بخونەوە . !
پ[٢٢] : ئەرێ (سوکەرین) لە جیگای شەکر ئەتوانرێ بە کار بهینرێ . . ؟
و : ئەوە نیوە سەدەیەکە کە لە جیگای شەکر «سوکەرین» بەکار دینرێت . . من بە نەخوشەکانم دەلێم کە سوکەرین لە جێگای شەکر بەکاربینن ، بەلام ئەبێ ئەم راستیە ژیلە یاد بێ کە هەرگیز نابێ فیلی خواردنەکان بە سوکرین کراون لەمە بکرێت وەك هنیدەك جوری شیرینی .
پ[٢٣] : لەو کاتەی مروڤ حەزی زوری لە شیرینی خورادن دەکا چی بکا . . ؟
و : بە بێ تیز و ترانە ئارویەك «خیار» بە دەنگ بجویتەوە لە ناو دەمتدا زور هوردی کەی . . حەزکردنی تۆ بو شەکر کەم دەکاتەوە .
پ[٢٤] : ئەرێ دروستە کە وەرگرتنی (٦٠٠) کالوری لە رۆژێکدا بەسە بۆ بەردەوامی ڕیژم ؟
و : ئەوە دروست نیە تاقیکردنەوەی مەیدانی هەزارەها موراجیع و نەخوش و لاواز و قەلەو و بە بێگومان ئەتوانم بلێم مروڤی ئاسایی و ئەوی ڕێژیم دەکا پێویست بە «١٢٠٠» کالوری هەیە بەلام مروڤی قەلەو و کریکار و خاوەن

ئیش پێویستی بە زیاتر هەیە .
پ[٢٥] : بۆ ئەوەی بە پەلە لاواز بی چاکترین ڕێگا چیە . . ؟
و : ئەم پرسیارە وەرام و پەرسێی تەواوی نیە چونکە ئەمە پەیوەندی بە جیاوازی مەرج و حالەتی گیانی مروڤەوە هەیە ، بەلام لە ڕێگای راست و پشکنینەوەدا ئەبێ بلێم کە هەر ڕێژیم گرتنێك ئەبێ بە یارمەتی و ژێر چاودێری پزیشکی چارەسەرکەر ئەنجام بدرێت . . چونکە ئەگەر هەر شتێك روودا ئەبێ بە زوترین کات پزیشکی چارەسەرکەر ئاگادار بکرێن . . بەلام ئەبێ ئەوە ژی بلێن و لە بیرنەکەین کە هەرگیز نابێ ئەو کەسەی ڕێژیم دەگرێ بە چەند روژێك دلسارد بێ لەبەر ئەوەی ب پەلەی ئەنجامی ڕێژیم بە دەستەوە نەهێناوە . . !
لێرەدا ئەبێ چەند جەدوەلێکی خواردەمەنی بۆ ئەوانەی ڕێژیم دەگرن بینمە بەرچاو . . . ئەم جەدوەلانە لە بلاوکراوێکی وەزارەتی تەندروستی عیراقید بە نهوی خواردنەکانی خەستەخانە» وەرمگرتوە :

(١)

جەدوەلی خواردنێکی عیلاجی کە کالوریەکانی کەمن و لە «١٠٠٠» کالوری تێناپەرێ . . ئەم جورە خواردنە بو لاوازکردن و چارەسەری نەخوشیەکانی شەکر و دل و دمارەکانی کە قەلەوی لە گەل دابێ .

| جوری خواردەمەنی | کێش گرام/کیلوگرام | ژمارە |
| --- | --- | --- |
| نان و سەمون | ٧٥ | یەك دانە |

| | |
|---|---|
| هێلکە | |
| یان پەنیر | ٣٠ |
| شیری بێ چەوری | ٥٠٠ |
| چای | ٥ |
| سەوزەی تەر | ٣٠٠ |
| سلاتە | ٣٠٠ |
| گوشتی گا یان بەرخ | ٣٥٠ |
| مێوە کە پورتوقال یان لەیمون یان | |
| هەلوچکە یان خوخ و قەیسی | ٣٠٠ |
| ئەگەر مێوە سێوبێ | ٢٠٠ |
| ئەگەر ترێ بێ | ١٤٠ |
| ئەگەر ئەنجیر بێ | ١٢٠ |
| یان موز بێ | ١٤٠ |
| ئەگەر شوتی بێ | ٧٠٠ |
| یان ئەگەر گوندورە و کالەك بێ | ٧٠٠ |

«ئەو گوشتەی گوتمان ٣٥٠ غم پێش کولاندنە چونکە لە پاش کولاندن دەبێتە ١٧٥ غم گوشتی بێ هێسقان.

«جەدوەلی دوەم»

خواردمەنی عیلاجی کەم کالوری کە «١٢٠٠» کالوری تێدایە دیسان بو لاواز و چارەسەرکردنی قەلەوی کە لەگەل نەخوشیەکانی شەکر و دل و دەمارەکان دەبێ.

| جورەکانی خواردەمەنی | کیش گرام/کیلوگرام | ژمارە | تێبینیەکان |
|---|---|---|---|
| نان یان سەمون | ١٢٥ | یەك دانە | |
| هیلکە | | | |
| یان پەنیر | ٣٠ | | |
| شیری بێ چەوری | ٥٠٠ | | |
| چای | ٥غم | | |
| گوشت | ٣٥٠ | | |

| | |
|---|---|
| سەوزەی تەر | ٣٠٠ |
| سلاتە | ٣٠٠ |
| رونی گەنمەشام یان رونی سائیل | ٥ |
| مێوە کە پورتوقالە یان لەیمونە | |
| یان خوخە یان هەلوچەکەیە | ٣٠٠ |
| یان سێوە | ٢٠٠ |
| یان ترێیە | ١٤٠ |
| یان موزە | ١٥٠ |
| یان ئەنجیرە | ١٣٠ |
| یان شوتی‌یە | ٧٠٠ |
| یان گوندورە و کالەکە | ٧٠٠ |

گوشتەکە پاش کولاندن دەبێتە ١٧٥ گرام

«جەدوەلی سێیەم»

خواردەمەنی‌یەکی کە ١٥٠٠ کالۆری دەدات

| جورەکانی خواردەمەنی | کێش کرام/کیلو گرام | ژمارە |
|---|---|---|
| نان یان سەمون | ١٧٥ | یەك‌دانە |
| برنج | ٥٠ | |
| هێلکە | | |
| یان پەنیر | ٣٠ | |
| شیری بێ چەوری | ٥٠٠ | |
| چای | ٥غم | |
| گوشتی گا یان بەرخ | ٣٥٠ | |
| رونی نەباتی یان رونی گەنمە شام | ٣٠ | |
| سەوزەی تەر | ٣٠٠ | |
| سەلاتە | ٣٠٠ | |
| مێوەکە بورتوقالە یان لەیمون | | |
| یان هەلوچکە یان خوخ یان | | |
| قەیسی‌یە | ٣٠٠ | |
| یان سێوە | ٢٠٠ | |

| | | |
|---|---|---|
| یان ترێیە | ١٤٠ | |
| یان موز | ١٤٠ | |
| یان ئەنجیر | ١٢٠ | |
| یان شوتی‌یە | ٧٠٠ | |
| یان گوندورە و کالەکە | ٧٠٠ | |
| گوشتەکە پاش کولان دەبێتە ١٧٥ گرام | ٧٠٠ | |

«جەدوەلی چوارەم»

خواردەمەنی ی مرۆڤی ئاسایی ئەبیٚ بەپێی

ئەم جەدوەلە بیٚ .

| | | |
|---|---|---|
| نان یان سەمون | ٤٠٠ | |
| پەنیر | ٤٠ | |
| یان هێلکە | دوو دانە | |
| کەرە | ٢٠ | |
| یان قەیماغ | ٣٠ | |
| مرەبا یان دوشاو | ٣٠ | |
| شیری تازە | ٢٠٠ | |
| ماست | ٢٠٠ | |
| شەکر | ٣٠ | بو چای و شیر |
| چای | ٥ | |
| گوشتنی گا یان بەرخ | ٤٠٠ | |
| رونی نەباتی یان سائیل | ٥٠ | حەددی بەرز |
| برنج | ٢٠٠ | |
| سەوزەی تەر | ٢٠٠ | |
| سەوزە بۆ سەلاتە | ٢٠٠ | |
| مێوە پورتوقال یان لیمو | ٤٠٠ | |
| یان شوتی | ٨٠٠ | |
| گوندورە و کالەك | ٦٠٠ | |
| کاستەر ونەشا | ٢٠ | |
| جیلی | ٤٠ | |

لەو کاتەی خورما دەدرێت ئەبیٚ
نیوەی کەمیەی مێوە بخورێت و خورما
ژی ئەبیٚ ١٠٠ گرام بیٚ یان ژی ٦٠
گرامی بیٚ دەنك بیٚ .

چاو دەکەن باش بزانین‌و ، ووریای چۆنیەتی خۆ لێ پاراستنیان بین ، کە مرۆڤ خۆی دەتکوانێ بەم ئەرك‌و کارانە هەڵسێ .

لێرەدا هەندێ لەو ئامۆژگاریانەی کە دەتوانین پێیان هەڵبسین ، دەخەینە ڕووەوە :

# هەندێ
# ساڵەقی هەنگاوی چاو



ڕۆشنبیری نوێ وەری گێڕاوە

لەبەر ئەوەی چاو باشترین ئەندامی لەشە کە یەزدانی مەزن بە ئادەمیزادی بەخشیوە ، ئەبێ ئەو بارو دۆخانەی کە کار لە

**فرمێسك :**

فرمێسکە لوو شلە - تراو - یێك بەسەر چاو دەرژێنێ کە ئەرکەکەی پاك‌کردنەوەی گلێنەی چاوو تەرکردنیەتی ، لە ئاکامی تووش‌هاتنی ڕۆژانە بۆ گەردو تەنی‌ی نامۆو گۆڕانی ئاووهەوا ، پێلوویش چاو پاقژ دەکاتەوەو دەیپارێزێت . وە لەو کاتەی پیواز وورد دەکەین یان دەگرێیین ڕادەیەکی زۆری فرمێسك پەیدادەبێ ، بەلأم هەرچەندە بەرەو پیریی بڕۆین ڕادەی چەندەکی‌ی ئەم شلەیە کەم دەبێتەوە . جا ئەگەر هاتوو چاو ووشك‌بوو ، ئەوە گلێنە ، لەبەر کۆبوونەوەی تەنی نامۆو گەردی دەوروبەر ، زیاتر دەهەنگێورێت‌و کولێ دەبێت . جا لەم کاتەدا ئەبێ پەنا ببردرێتە بەر پزیشکی پسپۆر بۆئەوەی ئەو دەرمانەی پێویستە بەکاربهێنیرێت دیار بکات .

ئەگەر هاتوو فرمێسك (شلە) زۆر بووو مایەوە ، ئەوە لە چاوی منال‌دا کە هێشتا دەمارە بچووکەکانی فرێدانی فرمێسکی بەستراوەو لە کاتی لەدایك‌بوونی بە باشی نەکراوەتەوە ، دەمێنێتەوەو دەبێتە هۆی ئاوسانی چاو .

وە لەو کاتەی منالێ ساڵی یەکەمی تەمەنی بەرێ دەکات شێوەرگەی فرمێسك فراوان دەبێ‌و فرمێسك بە کاری خۆی هەڵدەستێ . وە ئەگەر ئەمەش هەر نەبوو ، ئەوە عەمەلیاتێکی ساکاری بۆ دەکرێ‌و چاك دەبێتەوە .

هاتووچۆکردنی فرمێسك لە چاودا زیان‌بەخش نیە ، تەنیا لای پیرەکان نەبێت کە هەندێ جار دەبێتە هۆی گیرانی ئەو کوونە بچووکانەی کە فرمێسك تیایاندا هاتووچۆ دەکات . ئەمەش ئاسانەو ، یان بە شۆردنی یان بە عەمەلیات‌کردن چارەسەری دەکرێت .

**پسایی :**

هەندێ جار ماددەیەکی بچووك لە ناوەڕاستی تۆیکی چاوەوە دەجوولێتەوەو زۆر جار دەبیندرێ . وە هەرچەندە مرۆڤ بەرەو پیربوون بڕوات تۆیکی چاو بچووکتر دەبێتەوە ئەم

گەردیلانەش زۆرتر دەبن . جا لەم کاتەدا پێویستە پەپەنا ببردرێتە بەر پزیشك ، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو هەستیان بە کەمبینی‌ی کرد .

**چاویلکە :**

بەکارهێنانی چاویلکەی تایبەت‌و لەبار ، بەپێچەوانەی بۆچوونی هەندێ کەس ، زیانبەخش نیە . وەکو رت‌بینی بەپێ‌ی قەبارەو پێگەیشتنی چاو زۆر دەبێت‌و تا چاویش لە پێگەیشتن ئەکەوێ ناوەستێت .

لەسەر ئەو مندالآنەیە کە تووشی کورت بینی دەبن چاویلکە بەکاربهێنن بۆئەوەی بتوانن ئەوەی لەسەر تەختەرەشە دەنووسرێ بە ئەسانی بخوێننەوە . بەلآم ئەو مندالآنەی کە تووشی بەکاربهێنن بۆئەوەی کەم توانستی‌ی نووسین‌و خوێندنەوە بخەنە ئەم لاوە .

**چاو گتەنێکی هەستدارە :**

زۆر شت روودەدات کە کار لە رادەی بینین دەکات . بەوێنە سووربوونەوەی چاو لە ئاکامی ئاوسانی‌دا ، ماددەیەکی جیقنەیی قلمبچی پەیدا دەکات . لەم حالەتەدا ئەبێ چاوبە تراوی بایکاربۆنیت بشۆردرێت . وە ئەگەر هاتوو ئەم جیقە سپی‌یە سێ رۆژ مایەوە ، ئەوە ئەبێ پەنا ببردرێتە بەر پزیشك .

تەنی نامۆ بەئاسانی دەچێتە ناو چاوەوە ، وە لەژێر پەردەی سەرەوەی چاو دەمێنێتەوە ، یان بە گلێنەوە دەنووسێت یانیش بە سپیلکەی چاو . جا لەو کاتەی چاو سووردەبێتەوە یان خورەخوری دەکەوێتێ‌و ئاوی لێ دێ ، تەنە نامۆکە بەردیار دەکەوێ‌و دەشتواندرێ ببیندرێت . وە ئەگەر بەچاو نەبینرا ئەوە ئەبێ دیسان پەنا ببردرێتە بەر پزیشکی پسپۆر .

لەسەر یاری‌کەرانی ئەسکواش‌و بادمنتۆن‌و مەلەوانان پێویستە هەردەم چاویلکە لە چاویان بکەن ، نەوەك لەناکاو شتێك بچێتە چاویان‌و پەرۆشیان بکات . وە پێویستە کێلگەوانان‌و باخچەچی‌یەکان لە کاتی ئیشکردنیان‌دا وورياو هوشیار بن نەوەك لە پرێکا خۆلێ یان زلك یان شتی تری نامۆدار بپەرێتە چاویان‌و لەکاریان بخات‌و زیان بە چاو بگەیەنێت .

وە ئەگەر هاتوو چاومان لە شتێك داو ، یان زەبرێکی پێ کەوت‌و سوور هەڵگەرا ، ئەوە ئەبێ بەردەوام چاو هەڵێنین‌و بقوچێنین تا چاو دەگەرێتەوە بینینە سروشتی‌یەکەی .

**چەند حالەتی گشتی‌ی پزیشکی‌ی :**

سێ حالەت هەیە کە چاوی مرۆڤ دەهەنگێوێ بێ‌ئەوەی هیچ هۆیەکی دەرەوەیی کاری تیا بکات . حالەتەکانیش ئەمانەی خوارەوەن :

**خێل‌ی :**

دوای تێپەڕبوونی شەش هەفتە بەسەر لەدایك‌بوونی مندال‌دا ، هەندێ جار یەکسانی بینینی چاو تێك‌دەچێ ، چاوێك باش دەبینێ‌و چاوەکەی تر رادەی بینینی کەم دەبێ‌و ، وەك هەمان روانینی ئەوەکەی تر نابێ . وە لە هەندێ حالەتی هەندێ منالآن‌دا پێستێکی خواروخێچ لە چیتکی ناو لووت پەیدادەبێ‌و بەرەبەرە لەگەل گەورەبوون‌دا نامێنێ . بەلآم لە کاتی پەیدابوونی‌دا بەشی ناوەوەی چاو داگیردەکات . جا ئەگەر هاتوو چاو تۆزێ بەرەو لایەك جوولا ، ئەوە خوارخێچایەتی پێستەکە بەشێکی رەنگەکانی چاو دەشارێتەو خیل دەبیندرێت .

هەر لە کاتی لەدایك‌بوونی مندال تا تەمەنی دەگاتە چوار سالی ، ئەگەری چاو خێل‌بوونی هەیە . وە هەرچەندە زوو پەیدا بێ ، ئەگەری چارەسەرکردنی ئاسانتر دەبێ . وە مندالێ چاوخێل بەرلەوەی بچێتە قوتابخانە چاکتر وایە چاویلکە بەکاربهێنێ بۆئەوەی چاوی لێ رابێت .

رەش‌و پێشکەکردنی بیبیلەی چاو :

ئەم حالەتەش لە کاتی پیربوون روودەدات . وە پێویستە چاویلکەی بگۆڕێ ، بۆئەوەی توانستی‌ی بینینی چاو بگەرێنێتەوە ، یاخود ئەبێ عەمەلیات بکرێ‌و (پەردەی تاری بوو) لاببردرێت .

**ئاوی شین (گلۆکۆما) :**

لەم حالەتەدا چاو – رەق – دەبێ‌و هێز دەکەوێتە سەر ماسولکەی چاوو کار لە بینین دەکات . وە چاو سوور دەبێ‌و ئێش‌و ئازاریش بەرەبەرە زیاد دەبێ . ئەم حالەتەش ، لەو کاتەی کە مرۆڤ بەرەو پیری‌ی دەروات ، تووشی دەبێت .

وە پێویستە بە زووترین کات پەنا ببردرێتە بەر پزیشکی پسپۆر بۆئەوەی زیاتر تەشەنە نەبێت .

فەقێ (حسین)ی مەنتك و
نەخۆشخانەکەی

# پزیشکی لە ناو کوردەواری دا



عبد الرقيب يوسف[1]

«فەقێ حسین» پزیشکێکی میللی
گەورەو بەناوبانگ و شارەزای کورد بووە.
دووریش نیە گەورەترین و شارەزاترین
پزیشکی میللی ی چەرخی بیستەم بێ لە
کوردوستاندا، خزمەتێکی بێزادەی گەلی
کوردی کردووە، بەتایبەتی چونکی
خاوەنی نەخۆشخانەیێکی گوێزەرەوە بووەو
لە کۆچەریدا هەڵکەوتووە. وە لەبەر



ئەوەی ڕەوەندیی دەکردو بەردەوام گەرمیانو کوێستانی بەسەر دەکردەوەو ، سوارە شۆڕی کۆچەریی دەشتی هەولێر تا هەوارگەکانی ناوچەی ڕەواندوزو نزیکی شنۆیی لە کوردوستانی ئێراندا بووە ، ناوبانگی زۆر بڵاوە بووەو خەڵکی ئەم ناوچانە ، سوودێکی یەکجار زۆریان لێ بینیوە .

فەقێ حوسێن لە باوکیەوە (مام تەها) ، کە پزیشکێکی شارەزابووەو لە باوکیەوە (دەروێش عەلی – واتە باپیری فەقێ) شارەزایی لەجۆرەها نەخۆشی پەیدا کردووە ، بەتایبەتی نەخۆشی چاوو برینسازیو پێوەدانی مارو شکەستە . دەرمانەکانیشی بە زۆری لەو جۆرە گیایانە دروستو دەگرتەوە ، کە لەکاتی هاتووچۆکردنیدا بۆ گەرمیانو کوێستان کۆی دەکردەوە . وە داوودەرمانی دەرمانخانەشی بەکاردەهێنا .

بەڵێ . . فەقێ پزیشکێکی لەبارو ناسراوبووە ، تەماشاکردنێکی سەرپێی بۆ نەخۆش ، بەس بووە کە بزانێ نەخۆشییەکەی چیە . هەروەکو ئەگێڕنەوە ئەڵێن «ئەگەر تەماشای دەمی نەخۆشی بکردایەو لێدانی دڵی بگرتایە ، یەکسەر ئەیزانی نەخۆشییەکەی چی یەو ، جا ئەگەر نەخۆشییەکەی تاکە بابەو تیمارو دەرمانکردنی سوودبەخش نەبایە ، ئەوە یەکسەر پێی دەووت : بچۆ دەرمانت لام دەست ناکەوێ ! !» برینی بەداوی باریکی ئاوریشم دەدروییەوە . ئەگەر یەکێك مووی لەچاوی بهاتایە ، جێگەی یان مووەکەی دەسووتاند بێ ئەوەی برژانگی بسووتێو ئیتر جارێکی تر موو لە چاوی شین نەدەبووەوە . یەکێك ئەم (پەردە – هەور)ی لەسەر چاو بوایە ، چەند جارێك دەرمانی ئەکردو پەردەکە نەئەما(*) .

فەقێ حوسێن لە برینسازیدا بەتایبەتی (برینی خەنجەرو گوللە) شارەزاو دەستسووك بووە . وە زۆرجاریش دەستی لە هەندێ جۆر نەخۆشیدا ئەڕۆیی کە دکتۆران نەیاندەتوانی چارەسەریان بکەن بەوێنە – خدری ئەحمەد پاشای دزەیی ، دەنگی نووسا (کەوتبوو) بوو ، ئەوەندەی هاتووچۆی دکتۆرەکانی ئەکرد ، بێ سوود بوو . . هاتە لای فەقێ حوسێن ، ئەویش هەڵسا خوێنی لەژێر زمان بەرداو یەکسەر چاك بووەوە .

هەروەها شێخ مارف هەڵەجەیی ، شتێك (وەك شیرپەنجە بێ وابوو ) لە لووتی هاتبوو . . زۆر پەرۆشو لەبەری بێزار بوو . . ئەوەندەی سەری لە دکتۆرەکان دەدا ، بێ کەڵك بوو . ڕۆژێ هەڵسا سەری لە فەقێ حوسێن داو خۆی پیشاندا ، کە ئەویش دوای چەند جار دەرمانکردنی ، چاك بووەو ئیتر لە ئازاری ئێش ڕزگابوو .

نوری حوسێنی مەلا (یەکێك لە سەرۆکەکانی دزەیی یەکان بوو) لە ڕووداوێکی ئۆتۆمبیلدا دەستی دەشکێو ، دەچێ بۆ بەغداو ئەشیعە دەگرێ . . ئەنجام واپێی ووترا کەوا ئێسقانی دەستی ووردو خاش بووەو چارەی بۆ ناکرێ . . ئەویش بە پەشۆکاوییەوە گەڕابەوە دواوە . پاش ماوەیێکی کەم چووە لای فەقێ حوسێن . . ئەویش دەستبەجێ عەمەلیاتی دەستی کردو ئێسکێکی لێ دەرکردو ، ئیتر پەکی نەکەوتو دەستی لەکار نەکەوت .

## نەخۆشخانەی فەقێ حوسێن

فەقێ حوسێن ، نەك تەنیا وەکو ئەوانی تر ، پزیشکێکی میللیی کوردی بووەو بەس ، بەڵکو شوێنێکی تایبەتی بۆ ئیشکردنیو دەرمانکردنی نەخۆشان تەرخان کردبوو ، وە لەتەکیشیەوە شوێنێك کە تا ڕادەیەك لە نەخۆشخانە ئەچوو .

بوارو پاییزو هاوینانیش ، نەخۆشخانەکەی بریتی بووە لە ڕەشماڵێکی گەورەی حەوت ستوندار . دوو بەش بووە ، بەشێك بۆ پیاوانو ئەوەکەی تریش بۆ ژنان ، وە پەسارێك لە نێوان هەردوو بەشەکە هەبووە . بە چەشنی نەخۆشخانەش ، نەخۆشەکان لەوێ دەخەوتنو هەر نەخۆشێك بەپێی نەخۆشییەکەیەوە خواردنی تایبەتی بۆ دەکراو ، پێخەفو نوێنو کەرەسەی خواردنو خواردنەوەشیان لەهی ماڵەکەی خۆیدا جیابوو . دوو ڕەشماڵیشی لە تەکیەوە هەڵئەدا ، یەکێکیان بۆ دیوەخانەو ئەویتریان بۆ ماڵەکەی . لە زستانیشدا ، خانووەکەی نەخۆشخانە بووە . . ڕۆژ هەبووە بیست نەخۆشی پیاوو ژن (سەرەڕای . خزمو کەسوکاری نەخۆشەکان) لە نەخۆشخانە (ماڵ)ەکەیدا بخەوێ .

فەقێ حوسێن کە لە گەرمییانەوە ئەچووە (زۆزان) ، نەخۆشخانە کۆچەرییەکەی ئەپێچاو ، چوار پێنج یەکسمی بۆ گواستنەوەی ڕەشماڵو کەرەسەی نەخۆشخانەکەی تەرخان ئەکرد .

لە هاتووچۆی کوێستانو گەرمییانیدا بە کۆیەو بێتوێنو زێیی ستیروکانو قەسرو ماکۆسانیدا تێدەپەڕی ، وە لە هەر شوێنێك نەخۆش بووایە ، بارگەو بارخانەی لێ دائەکوتاو دەستی بەدەرمانکردنی نەخۆشان ئەکرد . جاری وا هەبووە چەند ڕۆژێك لە یەك جێگادا بمێنێتەوە بۆ بەسەرکردنەوەی تەندروستی نەخۆشان . زۆر وەخت لە هەوارگەی

(جونەر) لە هەورازی رایات لە نزیك حاجی ئۆمەراندا دەمایەوە . . ئیتر تا دەگەیشتە بن چیای هەڵگۆردو لە ئاقاری دێی (گوندە ژوور)ەوە لە سەر کانیەکەی بەردە رەش رەشماڵی لێ هەڵئەدا .

حاجی ئەحمەدی کوری فەقێ حوسێن ، ئەگێرێتەوە ئەڵێ ، زۆر جار لە کەشی هاوینیاندا بۆ ئەو دیوی کوردوستانی ئێران ئەپەڕییەوەو کوردەکانی ئەوێی دەرمان دەکردن .

فەقێ ، پیاوێکی زۆر چاكو بەزەیی بە نەخۆشان دەهاتەوە .

پارەیێکی زۆر کەمی لێوەردەگرتن پارەی لە مەلاو فەقێو شێخان قەت وەرنەدەگرت . . . بەم جۆرە ئەتوانین بڵێین ، کە نەخۆشخانەکەی فەقێ حوسێن نەخۆشخانەیەکی پزیشکیی کۆچەریی بووەو بە نموونەیی لە پزیشکیی میللی گەلی کورددا دائەنرێت .

لەبەر ئەوەی ناوبانگی نەخۆشخانەکەی بلاوە بووبووو خەڵکی زۆر روویان تێئەکرد ، شکایەتی لێکرا کە نەخۆشخانەی داناوە . لە کۆیەوە ، دەزگای میری بە شوێنی نارد ، کە بچێ بۆ کۆیە . . . بەلام رووی لە هەولێر کردو چووە لای مەلا ئەفەندی ، کە پیاوێکی دەسەلاتدار بوو . . وە پێی گووت کەوا میری بەشوێنی یا ئەگەرێ . ئەویش پێی ووت بچۆ ، حەکیمی خۆت بکەو تا من هەم تۆ ناگیرێیت .

ئەگێردرێتەوە کەوا جارێکیان دکتۆرێك بۆبینینو شارەزایی یەوە بۆ لای نێردرا دکتۆرەکە چەند پرسیارێکی پزیشکیی لێکرد بۆ ئەوەی بزانێ رادەی شارەزایی لەم بارەیەوە چەندە . لێی پرسی : خوێن کەبەر ئەبێو ئەکەوێتە رێ . . چۆن رائەوەستێتەوە ؟ -

هەروەها پێی ووت : (سودا) لە چییەوە پەیدا ئەبێ ؟ فەقێ حوسێنیش بە شارەزاییو باش وەلامی دایەوە .

ئینجا کە دکتۆرە زانی کەوا مرۆڤێکی شارەزایە ، داوای لێکرد کە لەگەلی ئیش بکاتو ئیجازەشی بۆ دەربکات بەلام فەقێ رازی نەبوو . . ووتی من ناتوانم واز لە رەوەندایەتیو کۆچەرییو هاتووچۆی گەرمیانو کوێستان بێنم ، وە ناتوانم لە تاکە شوێنێكدا جێگیر بم .

بەڵێ . . فەقێ حوسێن ، زیاتر لە (٥٠) پەنجا ساڵ خزمەتی خوشكو برای ٭هاوزمانی کردووە . . وەتا ئەو ساتەی دنیای رووناکی جێهێشتو لە ساڵی ١٩٥٤ دا سەری نایە گۆری -تەنگو تەسكو تاریك -وەو مۆمی (حەفتا)ی تەمەنی کوژایەوە .

## فەقێ حوسێنو رەوشتی

فەقێ حوسێن مرۆڤێکی هەڵکەوتووو زاناو ئاقڵمەند بووە . .

قسە خۆشو سەخی بووە . . بەرەحمو دڵنەرمو بتینفرە بووە . . حەزی لە هەژارو دەستکورتان ئەکردو یارمەتییانی ئەدا . پیاوێکی ئاینپەروەرو دیناس بووە . پیاوێکی لاوچاکی سوور سپیو مووزەردو سمێڵ گەورەو ریشی کوورت بووە . کورتەكو شالواری لەبەر دەکردو تفەنگو دەمانچەو خەنجەری دایم پێبووە .

فەقێ حوسێن ، دەوڵەمەندو گەورەی تیرەی «ئاری» بوو . .

لە عەشیرەتی مەنتك بوو ، کە لقێکە لە سوورچی سۆران ، زۆر سەخیو هەردەم خاوەن دیوەخانە بوو ، کە بەلای کەمەوە رۆژی نەبوو چل - پەنجا کەسێك لە دیوەخانەکەی ئەو نان نەخوات . بەرێزو گرانو لای خەڵك خۆشەویست بووە . دوو ژنی هەبوو . . پێنج کچو چوار کوریشی هەبوو : (عبدالرحمن) و (تەها) و (محمد) و حاجی ئەحمەد .

کە ئێستاش حاجی هەر رەوەندەو گەرمیانو کوێستان ئەکات . وەلە هەولێربوو کاتێك کە سەرم لێداو زۆر سوودم لەبارەی پزیشکیی باوکییەوە وەرگرت . بەر لەویش - لەم بارەیەوە -- زۆر سوودم لە برازاکەی فەقێ حوسێن (مام کریم مام شێخ) وەرگرتووە . پێش ئەم دووانەش زانیاریم لەمەر فەقێ حوسێنو نەخۆشخانەکەی لە زۆر کەسی ترەوە وەرگرتووە . یەکەم کەس کە باسو خواسی ئەم پزیشکە گەورەیەی بۆ کردم ، خوا لێخۆشبوو (ملا صدیق حاجی علی) بوو . . کە لە ساڵی ١٩٣٦ بریندار بووەو ، لە کۆیە بۆ برین دەرمانکردن بە خزمەت فەقێ حوسێن گەیشتووە . . . نەخۆشخانەکەی بینیووەو زۆر چاك لە یادی مابووەوە کە چۆن چۆنێك بووە .

مێژووی کۆچکردنی فەقێ حوسێن لە ١٩٥٢/٧/٥ دابووە لە دێی خوشکان لە قەزای چۆمان ، کە ئێستاکەش گۆری هەر لەوێیە ئەم مێژووەشم لەگەڵ وێنەکەیدا لەو نامەیە وەرگرتووە کە کاك اسماعیل عزیز - شێخی مەنتكی ، کە خزمی فەقێیە - بۆی ناردبووم .

**(٭) ئەوەی شایانی باسە دەربارەی چارەسەرکردنی موو لە (طبي اسلامي)دا ، برژانگ ئەبردرێن ، هەروەك (حسین بن اسحاق) ئەڵێ : «الشعر علاجه قطع الجفن» «(١٤٤)»ی کتێبەکەی «العشر مقالات في العین»**

**ماویەتی**

# بەرەو پێشکەوتن

## فڕۆکەکانی مارسیل داسۆ  برۆگیە لە جیهاندا

ئەمە سی ساڵی ڕەبەقە فڕۆکەکانی مارسیل داسۆ – برۆگیە ناوبانگی یەکی گەورەیان لە جیهاندا دەرکردووە ، چی فڕۆکە تایبەتەکان بە خاوەند کارەکانەوە یان فڕۆکە جەنگی یەکان .

سەرکەوتنی ئەم کۆمپانیایەو پەرەسەندنی خێرای لە ساڵی ١٩٨٠دا زۆر ئاشکراو دیار بوو ، ئەوەبوو سێ چارەکی بەرهەمی کۆمپانیاکە نێردرایە دەرەوە .

کۆمپانیاکە هەر لە سەرەتای دروستبوونیەوە زنجیرەیەکی جۆراوجۆری فڕۆکەی بۆ جۆرەها ئەرك‌و کارکردن بەرهەمهێناوە : هەر لە فڕۆکەی مەشق‌کردنەوە بگرە تا دەگاتە فڕۆکەی (ئەلفا - جت) تا فڕۆکە جەنگی یە پەرەپێدراوەکانی وەك فڕۆکەی (میراجی ٢٠٠٠) تا زنجیرەی فڕۆکەکانی (میراجی ٣) و (میراجی – ئێف ١) و فڕۆکەی (جاگوار) و فڕۆکەی (سوپەرئەتاندار) و (ئەتلانتیك) و لە فڕۆکەی مەدەنی‌دا وەکو فڕۆکەی فالکۆن ١٠ ، ٢٠ و ئێستایش (فالکۆن ٥٠) کە تاکوو ئێستا ٨٥ فڕۆکەی لێ داواکراوە کە زۆربەیان خەریکن دەنێررین .

ئەم فڕۆکەیانەی کۆمپانیای داسۆ - برۆگیە زۆر خێران‌و لە فرین‌دا پێشکەوتوون هەروەها لە باڵگرتنەوەو دابەزین‌دا . . سەرەرای ئەوەی ئەوپەڕی تەقەنیەو پێشکەوتنیان تێدا بەکارهێنراوە .



ئامێرێك بۆ وێنەگرتنی دەنگ

لە فەرەنسادا دەستیان بەوە کردووە وێنەی دەنگ بگرن . . ئەوەبوو کۆمپانیایەکی فەرەنسەوی ئامێرێکی دروستکردووە وەکوو کامێرا وایە پێویستە شریتێك بخرێتە بەشی سەرەوویەوە ئەگەر بویسترێت وێنەی دەنگی منداڵێك بگیررێت دەبێت دەست بە دوگمەیەکی تەنیشتەوە بنرێت ئەوا گورج تۆماری‌دەکات .

هەمان ئامێر بواری ئەوەت پێ دەدات گوێ لە گفت‌وگۆو دەنگەکە بگرێت کە تۆمارت کردوون ئەگەر بەدڵیشت نەبوو ئەوا دەتوانیت بە دەست‌نان بە دوگمەیەکی بچووك‌دا بیسڕیتەوە .

## پایسکل بەناو ئاودا

ئیفۆن لاگیر خەڵکی فەرەنسایەو ئێستا لە شاری میامی‌ی وولاتە یەکگرتووەکان‌دا دەژیت ، ئەم پایسکلە ئاوی‌یەی دروست‌کردووە بۆ ئەوەی بتوانێت ڕێگای دەریایی نێوان شاری



میامی‌و بەهامای پێ ببڕێت ، بەمەیش ئاوات‌و خەونە دێرینەکەی خۆی بەدی‌دەهێنێت .

دوو پەیکەری ڕۆمانیایی تەمەنیان (٢٥٠٠) ساڵە



هەزاران کەس هەموو ڕۆژێك لە کۆشکی (کیرینال) لە ئیتالیادا خڕ دەبنەوە . بۆ بینینی دوو پەیکەری بێوێنەی پەیکەرە نایابەکانی هونەری کۆن کە لەم دواییەدا لە نێو دەریادا دوور لە کەناری ئیتالیاوە دۆزراونەتەوە .

ئەم دوو پەیکەرە بەسەرهاتێکی سەیریان هەیە ، لاوێکی ئیتالیایی ڕۆژێکیان لەو کەنارە مەلەی دەکردو جاروبار دەچووە ژێر ئاوەکەوەو قوتکەی دەخواردەوە . لە قوتکە خواردنەوەیەکدا (واتە لە چوونە ژێر ئاودا) یەکێك لەم دوو پەیکەرە دەبینێت ، گورج دەڕوات ئاگاداری لێپرسراوان دەکات .

کە دێن پەیکەرەکە دەربێنن ، دەبینن پەیکەرێکی تریش لە پاڵیدایەو لە بارێکی نیوە باشدان .

ئەم دوو پەیکەرە لەناو پاپۆڕێك‌دا دەبن بەر لە بیست سەدە لەو شوێنەدا نوقمی ژێر ئاو بووە ، ئەو پاپۆڕە لە ئیتالیاوە بەرەو ئەسینای پایتەختی یۆنانی دەچوو ، ئەم دوو پەیکەرەیش دوو جەنگاوەر دەنوێنن لە جەنگاوەرەکانی ڕۆمان .

## کۆماری بیلیز :
## بچووکترین پایتەخت‌و کەمترین سوپا لە جیهاندا

بە چەپڵەو دۆڵ‌و زوڕناو سروودی نیشتمانی‌یەوە ، خەڵکی «بیلیز» ، ئالای بریتانیایان لە ئاسمانی دوا ئاوایی ئینگلیزی لە ئەمەریکای لاتینی‌دا – کە «بیلیز»ە– لابردو تێکیان شکاند .

لە مانگی ئابی «١٩٨١»ەوە ، لەدایك‌بوونی کۆمارێکی نوێ بە ناوی «بیلیز»ەوە بلاوکرایەوە .

کۆماری «بیلیز» کە بوو بە حەوتەم دەوڵەت لە ئەمەریکای لاتینی ، ڕووبەرەکەی (١٤٢) هەزار کیلۆمەتر دووجایی‌و ژمارەی دانیشتوانانی (١٥٠) هەزار کەسە . زۆربەیان بە زمانی ئینگلیزی قسە دەکەن .

گواتیمالا دراوسێی «بیلیز»ەو (١٠٠) سەد ساڵ دەبێ داوای دەکات‌و پیلانی داگیرکردنی دادەنێ گوایە بەشێکە لەو وڵاتە . لەبەر ئەمەشە بەریتانیا دوو هەزار سەربازی مەشق‌پێکراوو ژمارەیێ لە فیرۆکەو ڕۆکێتی دژبە فرۆکەی لە «بیلیز» هێشتووەتەوە بە نیازی بەرگری‌لێکردنی . . . وە چونکە تەنیا (٣٠٠) سێ سەد سەربازی هەیە .

## چەند باسێك ـــــ دەر

● لە بلاوکردنەوەی دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی‌داو دانانی مامۆستا «اسماعیل رسول» کتێبی «چەند باسێك دەربارەی ئەدەب‌و رەخنەی ئەدەبی» کەوتە بازارەوە .

مامۆستای دانەر ، لەم کتێبەیدا ، تێکرا چەند لایەنێکی ئەدەب‌و رەخنەی ئەدەبی کوردی روون دەکاتەوە . . . سەرنج دەربارەی ئەدەبی فۆلکلۆرو حیکایەتی میللی لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی‌دا دەخاتە روو . پەنجەش بۆ لایەنگیری‌و هونەرو سیاسەت‌و زمانی ئەدەبی یەکگرتوو بێلایەنی‌ی لە رەخنەی ئەدەبی‌دا درێژ دەکات . وە بە چەند ووشەیەکیش دەربارەی «رصافی»یەوە کۆتایی بە باسەکانی دێنێت .

کتێبەکە (١٦٠) لاپەرەی قەوارەی ناوەندی دەگرێتە خۆیەوە . . دەزگای (الحریة) لە چاپی داوەو نرخەکەشی (١٦٠) فلسە .

**دیوانی بنەوشەکان**

● هەر لە بلاوکردنەوەی دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی – زنجیرەی شیعر –دا ، کۆمەڵە شیعری ئەدیب‌و نووسەر کاك عبدالرزاق بیمار بە ناوی «دیوانی بنەوشەکان» کەوتە بازارەوە . مامۆستای ناوبراو لە نۆبەرەی کۆمەڵە شیعری‌یەکەی‌دا ، کە هەڵبژاردەی سەرپێی بەرهەمە شیعرەکانیەتی «بە تواناوە رێبازی قوتابخانەی واقیعی گرتووە لە دانانی هەڵبەستا . . . واقیعەتی نوێی بەرەو ئیشتراکیەت» ، وە هۆنراوەکانی هەروەك دەردەکەوێ «دادو بێداد لە دەست دیلی‌و زیندان ئەکەن ، هەوارگەیان تەنگەبەرە ، ئاوو هەوای هەڵمژینیان پڕ تەپو تۆزە ، بێئاوییان پێوە دیارە» .

یەکەم هۆنراوەی کە «بۆ ئافرەتان»ە تیایدا هۆنیویەتیەوە :

**تا ووشە هەڵ ئەگرێ : رۆژ باش**
**تا دێر ئەگرێ ووشەی رەنگین**
**ئەیکەم بە بەند ، بە هۆنراوە**
**پێش‌کەشت بێ هەزار رۆژ باش**
**ئەی پەری ، ئەی ئافرەتی باش**
**ئەی مەردی ژین !**

کۆمەڵەکە بریتی‌یە لە (٢١) هۆنراوەو (٩٦) لاپەرەی قەوارەی ناوەندی‌یە . لە دەزگای (الحریة) لە چاپ دراوە .

بەرهەمی نوێی کتێبخانەی کوردی

**ێشەیەك لە رێزمانی کوردی‌دا**

● کێشە لەسەر زمان‌و رێزمانی کوردی‌دا زۆرە . ئیستاش لەگەڵ دابێ ، چەندەها لایەنی رێزمانی هەن . بێگومان زۆر – کە زمانەوانان دەمەتەقەی زۆریانە لەسەری . بەو نیازەی بگەنە ئەنجامی راست‌و لایەنە شاراوەکانی زمانی کوردی ، بەپێی تواناوە ، روون بکەنەوە .

جا کتێبی (کێشەیەك لە رێزمانی کوردی دا) کە کاك رەئووف ئەحمەد تالانی داناوەو لەم دواییەدا دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی بلاوی‌کردەوە . – تا رادەیەك – مۆرفیمی «وە» ی لە زمانی کوردی‌دا – بە گوێرەی بۆچوون‌و بیروڕای دانەر – روون کردووەتەوە .

کاکی دانەر ، ئەو نووسینانەی هەڵسەنگاندووە کە دەربارەی فۆرم‌و هەڵکەوتی مۆرفیمی دووبارەو بەردەوامی‌و نیشانەی کاری رابوردووی نزیکەوە نووسراون . لە پاشان – بە پێی لێکۆڵینەوەی خۆی – هەڵکەوتی مۆرفیمەکانی لە دەستە شێوەی شارباژێر (بابان)و دەستە شێوەکانی (موکری‌و سۆرانی)داو دەستە شێوەی ئەردەڵانی‌و ، لە مەڵبەندی گۆران‌و لێ جاف‌و هەورامی‌و لوری . . . هەروەها لە کرمانجی سەرووەدا روون کردووەتەوە . دیسان ، لە قۆناغێکی ترەوە ، باسی پاشگرو نیشانەی «وە» وە – لە رووی ئەرکەوە – دەکات .

کتێبەکە بریتی‌یە لە (٢٤٦) لاپەرەو لە دەزگای «الحریة» لە چاپ دراوە .

**دیوانی خادم – بەرگی دووەم :**

بوژاندنەوەو ساغ‌کردنەوەی سامان‌و کەلەپووری ئەدەبی نەتەوەکەمان سودێکی ئەوتۆ ئەبەخشێ کەهاوتاو وێنەی کەمە . وە هەرچەند خزمەت‌کردنی زمان‌و ئەدەب ، خزمەت‌کردنی نەتەوەوو ولاتە ، بەلام سوپاس بۆ یەزدان‌و ئافەرینیش بۆ کاك «جمال محمد محمد أمین» کە توانی بەرگی دووەمی «دیوانی خادم» بخاتە ژێر دەستی ئەدەب دۆستان‌و خوێنەوارانی کوردو غەیری کورد .

لە ئەنجامی خوێندنەوەی بەرگی دووەم دا ، ئەوە روون دەبێتەوە کەوا ئەم بەرگە زۆر جیاوازە لە بەرگی یەکەم . . چ لە رووی لێکدانەوەی شیعرەکان ، چ لە رووی رێکخستنی

شیعرەکان ، بەتایبەتی چونکە ئەو شیعرانەی کە پێویستیان بە لێکدانەوە هەیە ، لە پەراوێزدا واتاکەیان نووسراوەتەوە ، بە پێچەوانەی بەرگی یەکەمی کە تەنیا فەرهەنگۆکێك بەرچاو دەکەوێ .

شایانی باسە ، ئەم بەرگەش هەر لە بلاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی‌یە . وە دەزگای «الحریة» لە چاپی داوەو «٣٩٢» لاپەرەیە .

دیلام – شاعیرو ئازادیخواز :

«جوانی سروشت و دلداری و جوانی ئافرەت لە هۆنراوەکانی دیلان دا . دیلانی نیشتمانپەروەرو ئازادیخواز . روخساری هۆنراوەکانی دیلان و بەرهەمی شاعیران و تاقی‌کردنەوەی شیعری دیلان» . ناوەرۆکی چاپکراوێکی نوێن بە ناوی «دیلان – شاعیرو ئازادیخواز» ، لە نووسینی کاك دلشاد علي و . لە چاپکراوەکانی کۆری زانیاری عیراق – دەستەی کورد –٥ . چاپکراوەکە «٧٦» لاپەرەیە .

– «زانستی ئاوەلواتا . . .» .

دیسان هەر لە چاپکراوەکانی کۆری زانیاری عیراق «دەستەی کوردی» . وە لە دانانی مامۆستا دکتۆر کامل حسن البصیر – «زانستی ئاوەلواتا – لە رەخنە سازی یۆنانو رۆمانی و عەرەبی و ئەوروپی‌یەوە بۆ رەخنە سازی کوردی» کەوتە بازارەوە .

نەخشەی ئەم لێکۆلینەوەیە لە چوار بەشی سەرەکی پێك هاتووە : بەشی یەکەم ، تێ‌روانینێکی گشتی‌یە دەربارەی میتەفۆر لە رەخنە سازی یۆنانی و رۆمانیدا . بەشی دووەم ، سەرنجێکە لە رەخنە سازی عەرەبی بۆ دەست‌نیشان کردنی چۆنیەتی باسی مەجاز لە لایەن زاناکانی رەوانبێژی عەرەبی‌یەوە . بەشی سێ‌یەمیشی پیاچوونەوەیەکە لەگەل چەند رەخنە سازێکی ئەوروپی هاوچەرخ بۆ . دەست‌نیشان کردنی گۆرانەکانی باسی میتەفۆر لە سەردەمی دێرینەوە هەتاکو رۆژگاری ئێستەمان دوابەشیش ، لێکدانەوەی باسی (خوازە)یە لەلای ئەو زانا کوردانەی کە لەم باسەدا ئیشیان کردووە ، لەگەل چەسپاندنی بیروڕا تایبەتیەکانی دکتۆر لەم رووەوە .

● **گۆرانیەکانم** :

دیسان هەر لە چاپکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی زنجیرەی کەلەپوور . گۆرانیەکانی هونەرمەندی گەورەو نەمری کورد – خوالیخۆشبوو «علي مردان» ، کە شیعری گۆرانی‌یەکانیەتی ، کەوتە ژێر دەستی خوێنەرانەوە .

«گۆرانیەکانم » ، (٢٧٢)لاپەرەیەو ، لە دەزگای «الحریة» لە چاپ دراوە .

**«گۆرانی بێژی لێهاتوو . ئەو کەسەیە**
**کە زەمینەیەکی بەتین و فراوانی هەبێ**
**لە ئاوازو گۆرانی میللی و مەقامی**
**کوردی و . رەسەنایەتی مەقامی**
**کوردی بپارێزێ . . . وە ئەبێ شارەزایی**
**ئاوازی جۆربەجۆری ناوچە جیاجیاکانی کوردستان بێ .**

**(خوالیخۆشبوو علي مەردان)**

● **پرد**

کۆمەلە چیرۆکی «پرد» ، کە یەکەم بەرهەمی چاپکراوی احلام منصور ەو ، بریتی‌یە لە (١٨) کورتە چیرۆك لە ٢٣٣ لاپەرە ، کەوتە ژێر دەستی خوێنەوارانەوە .

کۆمەلە چیرۆکەکە ، کە دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی بلاوی کردەوە ، بەگشتی ، چەند هەلوێست و تەگەرەی کۆمەلایەتی چارەسەر دەکات . چیرۆکەکان هەندێکیان کاتی خۆی لە رۆژنامەو گۆفارەکان بلاوکراونەتەوەو ئەوانی دیکەش بۆ یەکەم جار . دەزگای «الحریة»ش لە چاپی داوە .

● **دەروازەی دراما**

لە نووسینی کاك أحمد سالار و بلاوکردنەوەی دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی – زنجیرەی لێکۆلینەوە – دا ، بەرگی یەکەمی کتێبی «دەروازەی دراما» کەوتە بازارەوە .

«دەروازەی دراما» دراماو نیشتمانی سەرهەلدانی دراماو چەند باس و سەرنجی دراماو روون دەکاتەوە . کتێبەکە بریتی‌یە لە (١٠٤) لاپەرەی قەوارەی ناوەنجی .

